ADIBAN

ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا،فولکەی گۆزەکان، نزیك ناوەندیی ڕۆژهەڵاتی کوڕان.

پەیوەندی: 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369.

Email: bookadiban@gmail.com

Facebook: https://www.facebook.com/eadiban/

## ناسنامەی کتێب

ناونیشان: ئامۆژگارییەکانی لوقمانی حەکیم.

کۆکردنەوەی: پشتیوان عبدلرحمان.

بابەت: پەند و ئامۆژگاری.

نۆرەی چاپ: دووەم.

بڵاوکەرەوە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠میلادی.

تیراژ: ١٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (٢٦٠٩) ساڵی (٢٠١٩) پێ دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە، مافی لەچاپدان و کۆپیکردنی پارێزراوە بۆ ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

# کورتەیەک لە ژیاننامەی لوقمانی حەکیم

لە سەرەتادا کە دەبێت ئاماژەی پێ بدەین هەموو ئەو گێڕانەوانەی کە لەسەر ژیانی لوقمانی حەکیم باسدەکرێت چەند گێڕانەوەیەکی جیاواز و جۆراوجۆرن، ئێمەش هەولدەدەین کە تەنها پوختەیەک لەسەر ژیاننامەکەی بە ئێوەی خوێنەری خۆشەویست ئاشنا بکەین (لە کاتێکدا بەرپرس نین لە ساغکردنەوەی و سەلماندنی ئاستی ڕاستی و دروستی ژیانەکەی، تەنها وەکو زانیارییەکان دەگوازینەوە تاکو ئێوەی خۆشەویست شارەزاییەکتان لەسەر ژیانی هەبێت).

لوقمانی حەکیم پیاوێکی دانا بووە و، لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە و سوورەتێکی بە ناوەوە ناونراوە (سوورەتی لوقمان)، ئامۆژگارییەکانی لوقمان لە لای خەلکی بریتین لە چەند ئامۆژگارییەکی جوان ناوازە و کۆمەلێک وتە کە لە تێگەیشتنێکی فراوان و ناخێکی قوول و ئەزموونکردنێکی کردارییەوە سەرچاوەیان گرتووە و هەلقوولاون. هەروەها ئەوەی بە حەکیمیش ناسراوە هۆکاری بۆ زۆری کارامەیی و لێهاتوویی بووە لە چارەسەرکردنی ئەو کێشە و گیروگرفتانەی کە ڕووبەڕووی بووەتەوە، بۆیە لەبەر ئەمەشە کە بووەتە قاچی و دادوەر بۆ نەتەوەی بەنو ئیسرائیل.

## ڕەچەلەک و نەژادی

هەندێک دەلێن ناوی (لوقمانی کوڕی باعور)ە، یان دەلێن کوڕی (عەنقای کوڕی سەدونە)ە، وتراویشە کوڕی (پاران)ە. دەوترێت کوڕی خوشکی ئەیوب پێغەمبەر (سەلامی لەسەر بێت) بووە، یان کوڕی پووری بووە. ڕەچەلەکی دەگەڕێتەوە سەر خێزانی (ئەسوان) لە میصر و، لە سەردەمی داود پێغەمبەردا (سەلامی لەسەر بێت) بووە

و، له شـاری (نـوبه)دا ژیـاوه. بەڵام له قورئـانی پیـرۆزدا ئامـاژه به شوێن و کات و سەردەمەکەی نەکراوه.

## شێوەی ڕووخساری لوقمانی حەکیم

لوقمان بەندەیەکی ڕەش پێستی لچ ئەستوور و قاچ قڵیشـاو و قژی لوول و باڵای کورت بووه.

دەڵێن جارێکیان کەسێک پێی دەڵێت: لوقمان به ڕاستی شێوەیەکی نـاحەز و ناشـیرینت هەیە، ئەویـش وەڵاکـی دەداتەوه: ئایـا ڕەخـنه و عەیب له شێوەی نەخشەکه دەگریت یان لەو کەسـەی که نەخشـەکەی کێشاوه.

خـودای گەورەش له بـری ئەو شـێوەیەی بەوه ڕێـزی لـێ نـاوه و شەرەفمەندی کردووه که له قورئانه پیرۆزەکەیدا ناوی بردووه و، له بری جوانی شـێوەکەی ئەخـلاق و هەڵسوکەوتێکی جوان و ناوازه و حیکمەت و داناییەکی تۆکمه و پڕ بەهای پێبەخشیوه.

وەکو گێڕانەوەیەک که دەوترێت ئەبو دەرداو وتوویەتی: لوقمـان نه نەسـەب و خێزانێکـی بـاش و بەناوبانـگ و، نه مـاڵ و سـامان و نه تایبەتمەنـدی و شـتێکی جیـاکراوەی وەهـای له ڕووی مـاددییەوه نەبووه، تەنهـا پیـاوێکی هەژار و فەقیـر بـووه. به ڕۆژ نەخەوتـووه و، هیچ کەسێکیش نەیبینیوه و لەبەر چاوی کەسدا پێداویستی خۆی له ئاودەسـتکردندا جێبەجـێ نەکـردووه و هـیچ کەسـێک بەو شـێوەیه نەیبینیـوه (ئاشـکرایه که زوو وەکـو ئێسـتا نەبـووه که شـوێنێکی دیـاریکراو و داپۆشـراو نەبووه که وەکو ئاودەست بەکـاربهێنرایه). وەکـو باسـدەکرێت که ژنـی هێنـاوه و منداڵیشـی هەبـووه بەڵام منـداڵەکانی مـردوون، له گێڕانەوەیەکـی تـردا دەوترێـت: که تەنهـا کـوڕێکی هەبـووه زۆری خۆشویسـتووه که ئامۆژگارییەکـانی له

لوقمــانەوە دەگێــڕدرێتەوە بــۆ ئەو کــوڕەی بــووە ئاراســتەی ئەوی کردووە و بە کوڕی شیرینم و کوڕی خۆم بانگی کردووە.

## کار و پیشەی لوقمانی حەکیم

ئەو هەواڵانەی پێمـان گەیشـتووە بە چەند گێڕانەوەیەکی جیـاواز لە بــارەی سروشــتی پیشــەکەیەوە هــاتووە، هەنــدێک دەڵــێن: پیشــەی دارتاشی بووە، هەندێک گێڕانەوەش هەیە کە پیشەی بەرگدروو بووە، هەروەها دەوترێت: شوانیشی کردووە، بۆ ماوەیەکیش قازی نەتەوەی بەنی ئیسرائیل بووە.

هەمــوو زانایــان کــۆدەنگن لەســـەر ئەوەی کە لوقمــان حەکــیم و دانایەکی وەلی و خواپەرست بووە و، پێغەمبەر نەبووە.

پێغەمــبەری خۆشەویســتمان (ص) لە فەرموودەیەکـدا دەفەرموێـت: "لوقمـان بەنـدەیەک بـووە کە زۆر بیریکـردووەتەوە و بیرکـردنەوەی زۆر بـووە، گومــانی باشــی بــردووە و، زۆر بێـدەنگ بــووە، خــودای گەورەی خۆشویســـتووە و، خــودای گەورەش منەتــی لەســـەر نــاوە بەوەی حیکمەت و دانایی پێبەخشیوە".

## باسی لوقمان لە قورئانی پیرۆزدا

خــودای گەورە لە قورئـــانی پیـــرۆزدا باســـی لوقمـــان دەکـــات و ســووڕەتێکیش بە نــاوی ئەوەوەیە بە نــاوی ســـوورەتی لوقمــان، کە باســی وتەکــانی دەکــات  کە بە شــێوەی ئامۆژگــارییە و ئامۆژگــاری کــوڕەکەی کــردووە و، قورئـــانی پیـــرۆزیش ئەو ئامۆژگارییـــانەی تۆمارکردووە و دەیگێڕێتەوە.

**ئامۆژگارییەکانیش لەم چەند ئایەتەدا لە سوورەتی لوقماندا
باسکراوە، ئەوانیش:**

قَالَ تَعَالَى: ﴿ الٓمٓ (١) تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ (٢) هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّلۡمُحۡسِنِينَ (٣) ٱلَّذِينَ
يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ (٤) أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ
وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ (٥) وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ
بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ (٦) وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ
مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٧) إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ (٨) خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ
(٩) خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن
كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ (١٠) هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ
فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ (١١) وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا لُقۡمَٰنَ
ٱلۡحِكۡمَةَ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِلَّهِۚ وَمَن يَشۡكُرۡ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٞ (١٢)
وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ (١٣)
وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي
وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ (١٤) وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا
تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ
فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (١٥) يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي
صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ (١٦) يَٰبُنَيَّ أَقِمِ
ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ
(١٧) وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ (١٨)
وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ (١٩) أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ
ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ (٢٠) ﴾ **لقمان:** ١ - ٢٠

واتە:

12/ سوێند بە خوا بە ڕاستی دانایی و حیکمەتماندا بە لوقمان (و پێمان وت) سوپاسی خوا بکە جا هەر کەس شوکرانەبژێری خوا بکات ئەوە بێگومان شوکرانەبژێری (بۆ قازانج و سوودی) خۆی دەکات.

13/ (ئەی موحەممەد (ص) باسی ئەو کاتە بکە کە لوقمان بە کوڕەکەی وت کە ئامۆژگاری دەکرد (وتی): ئەی کوڕە شیرینەکەم هاوبەش بۆ خودا دامەنێ چونکە بە ڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە.

14/ وە فەرمانمان داوە بە ئادەمی (بە چاکی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ) دایک و باوکیدا، دایکی هەڵیدەگرێت بە دووگیانی (پێی لاواز دەبێت) لاوازی لە دوای لاوازی و، بڕینەوەی لە شیر لە (دوا تەمەنی) دوو ساڵییەوە، (وە فەرمانمان بە ئادەمی دا) کە سوپاسگوزاری من (خودا) و باوک و دایکت بکە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان.

15/ وە ئەگەر (باوک و دایکت) ئەوپەڕی هەوڵیاندا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێ بکەیت بە هاوبەشی من کە هیچ زانیارییەکت پێی نییە ئەوە گوێڕایەڵییان مەکە، بەڵام لە دنیادا زۆر بە چاکی هاوڕێیەتییان بکە و شوێن ڕێبازی کەسێک بکەوە کە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای من (لە دوارۆژدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆ لای منە ئینجا هەواڵتان دەدەمێ بەو کردەوانەی کە کردووتانە.

16/ (لوقمان وتی) ئەی کوڕە شیرینەکەم بە ڕاستی ئەو (چاکە و تاوانە) ئەگەر کێشی تۆوە خەرتەلەیەکیش بێت لە ناو بەردێکدا یان لە ناو ئاسمانەکان یان لە زەویدا بێت خودا (لە قیامەتدا) دەیهێنێت، بە ڕاستی خودا وردبین و ئاگادارە.

17/ ئەی کوڕە شیرینەکەم نوێژ بەجێ بهێنە و فەرمان بکە بە چاکە و بەرگری بکە لە خراپە، هۆگر و بە ئارام بە لەسەر هەر بەڵا و

ناخۆشییەک تووشت دێت، بێگومان ئەوە لەو کارە گەورانەیە کە خودا پێویستی کردووە.

18/ ڕوو لە خەڵک وەرمەگێڕە و بە کەشخە و فیزەوە مەڕۆ بە زەویدا، چونکە بە ڕاستی خوا هیچ خۆبەزلزانێکی شانازیکەری خۆش ناوێت.

19/ وە لە ڕۆیشتندا مامناوەندی بە (نە هێواش و نە پەلە)، (لە قسەکردندا) دەنگت نزم بکەرەوە، بە ڕاستی ناخۆشترینی دەنگەکان دەنگی (سەڕەی) گوێدرێژە.

خودای گەورە لەم ئامۆژگارییانەدا خێرێکی زۆری کۆکردووەتەوە و، ڕێگریشی لە زۆرێک لە شەڕ و خراپەکان کردووە.

## ئازادکردنی و بەسەرهاتی لوقمان لەگەڵ داود پێغەمبەردا (سەلامی خودای لەسەر بێت)

وەک باسدەکرێت لوقمان بەندەی (عەبدی) کەسێک بووە، دەڵێن جارێکیان خاوەنەکەی چووەتە ئاودەست و زۆری پێچووە، لوقمانیش دەنگی بەرزکردووەتەوە و وتوویەتی: دانیشتنی زۆر لە ئاودەستدا دەبێتە هۆی سیسبوونی جگەر و دروستبوونی مایەسیری و بەرزبوونەوەی پلەی گەرما، پاشان ئەویش دوای کەمێک دانیشتن هەستا و ڕۆیشت، کاتێکیش لە ئاودەست هاتووەتەدەرەوە فەرمانیکردووە کە ئەو وتانە بنوسرێتەوە و لەسەر دەرگای ئاودەستەکە هەڵبواسرێت تاکو خەڵک لە ئاودەستدا زۆری پێ نەچێت و تووشی ئەو زیانانە نەبێت.

لە بەسەرهاتێکی تردا لەسەر دانایی و حیکمەتی لوقمان دەیگێڕنەوە کە: لوقمان بەندەیەکی حەبەشی بووە و پیشەی دارتاشی بووە، جارێکیان خاوەنەکەی پێی دەڵێت: بڕۆ ئەو بەرانەمان بۆ سەرببڕە،

ئەویــش دەچێــت و ســـەریدەبڕێت و دوایــی دێــتەوە بــۆ لایــان و، خاوەنەکەی پێی دەڵێت: باشـترین دوو پارچەی گۆشـتی ئەو بەرانەم بـۆ بهێنە، لوقمـانیش دەچێـت زمـان و دڵەکەی بـۆ دەهێنێـت. پاشـان دەڵێت: بڕۆ ئەو بەرانەی تر سـەرببڕە، ئەویش سـەریدەبڕێت، پاشان پێی دەڵێت: خراپتـرین دوو پارچەی گۆشـتی ئەو بەرانەم بـۆ بهێنە، لوقمـانیش دەچێـت بە هەمـان شـێوە زمـان و دڵەکەی بـۆ دەهێنێـت، ئەویش بە لوقمان دەڵێت باشـە من پێم وتیت باشـترین دوو پارچەی گۆشتی ئەو بەرانەم بۆ بهێنە تۆ زمانی و دڵەکەیت هێنا و، پاشـان بـۆ خراپترین دوو پارچەی بەرانەکەی تریش هەر زمانی و دڵەکەیت هێنا، باشە ئەمە بۆچی؟

لوقمانیش وەڵامیدایەوە و پێی وت: هیچ شوێنێک لەو دوانە باشتر و پاکتر نییە ئەگەر بە باشـی و پاکی ڕابگیـرێن و بپارێزرێن، هەروەهـا لەو دوانەش خراپتر و پیستر نییە ئەگەر بە خراپە بەکاربهێنرێن.

بـۆیە خـاوەنەکەی لەســەر ئەو هەڵوێسـتە بە حـیکمەت و دانـایی و زیــرەکییەی ئــازادی کــرد، دوای ئازادبوونیشـــی ولاتـــی میصـــر بەجێدەهێڵێت و دەچێتە ولاتی فەلەستین و، لەو ماوەیەشدایە کە خوای گەورە داود پێغەمـــبەر (ســـەلامی خـــودای لەســـەر بێـــت) وەکـــو پێغەمبەرێک ڕەوانە دەکات.

لوقمـانیش بە کـرێ کـار بـۆ داود داود پێغەمـبەر (سـەلامی خـودای لەسەر بێت) دەکات، ئەویش بـۆی دەردەکەوێت کە لوقمـان کەسـێکی دانا و حەکیمە بۆیە چاودێری دەکات تاکو ببێت بە قاچی بۆ نەتەوەی بەنو ئیسـرائیل، هەروەهـا لوقمـانیش لە سـەر دەسـتی داود پێغەمـبەردا خۆشەویســـتی خـــوای گەورەی بەدەســـتهێناوە و خـــوای گەورەش پشکێکی زۆری زانست و حیکمەتی پێ بەخشیوە.

## کۆچی دوایی و مردنی لوقمانی حەکیم

دوای ئەوەی کە ئازادکرا و لە کەسێکی بەندەوە دەبێتە قاچی، وەکو باسدەکرێت تەمەنێکی زۆر ژیاوە. دوای ئەوەی کۆچی دوایی دەکات دەڵـێن کە گـۆڕەکەی لە (گبریـایە) لە خـۆرهەڵاتی دەریـاچەکەوە، هەروەهـا دەوترێـت کە گـۆڕەکەی لە نـاوچەی (بلجرشـی)یە لە خێڵـی غامد لە گوندێکدایە کە بە (حزنە) ناسراوە.

چەند خاڵێک زۆر بە پوختی لە ئامۆژگارییەکانی لوقمانەوە باس بکەین:

ئاشـکرایە کە ئەو ئامۆژگارییـانەی لوقمـان کە لە قورئـانی پیـرۆزدا باسـکراوە ئامـاژەی بە چەند شـتێکی زۆر نـاوازە کردووە و پەنـجەی خسـتووەتە سـەر چەنـد خاڵێـک کە بە درێژایـی ژیـانی مرۆڤـایەتی بە بەردەوامی بە پێی جیاوازی ئاست و کەسـەکان دەتوانرێت لە شـوێنی خۆیـدا بەکاربهێنرێـت و سـوودی بەردەوامـی لێوەربگیرێـت، ئـێمەش چەنـد لایەنێکی کەم بە چەنـد خاڵێک بە پوختی باسـدەکەین (سـەرای ئەوەی کە چەنـدین کتێـب لەم بـارەیەوە نووسـراوە، بەڵام بـۆ ئەوەی درێژەی پێنەدەین تەنها چەند خاڵێک بە پوختی باسدەکەین):

1. بڕوابوون بەخـودا و بە تـاک و تەنهـا زانینـی و، بە هـیچ جۆرێـک هاوەڵی بۆ دانەنێین.

2. دەبێت دایک و باوک ئامۆژگاری منداڵەکانیان بکەن، چونکە ئەوە ئەرکی لەسەریان نەک تەنها شێتکی سادە بێت، هەروەهـا بەجـوانترین شـێوە ئامۆژگارییـان بـکەن، تـاکو ئەوانـیش لەسـەر ڕێگەیەکی ڕاسـت پەروەردە بین کە ئەوە مافی منداڵە لەسەر دایک و باوک.

3. گفتوگـۆکردن لەگەڵ منداڵانـدا کە هەم بە شـێوەیەکی دروسـت پەروەردە دەبـن، بەوەش تاکەکـانی خێـزان بـاش دەبـن و بەمەش کۆمەڵگەیەکی تەندروست و سەلامەت پێکدێت.

4. هەوڵدانی دایک و باوک بۆ دۆزینەوەی کێشەکانی منداڵەکانیان و چارەسەرکردنیان، تاکو لە داهاتووشدا ڕووبەڕووی هەر کێشەیەک بوونەوە دایک و باوکیان ببنە پەناگەیەک بۆیان و تەنها ڕوو لەوان بکەن نەک بچنە دەرەوە و لە هەر شوێنێک بێت کە دیارنییە ئەوەی کە دەوترێت بۆ چارەسەرکردنیان ئایا گونجاوە یان بە شێوەیەک لە شێوەکان بە لاڕێدا بردنیان و سەرگەردان بوونیانە لە بری ئەوەی چارەسەری کێشە و گیروگرفتەکانیان بۆ بکرێت.

5. هەڵبژاردنی بێدەنگی بەسەر قسەکردندا، چونکە وتراوە: ئەگەر قسەکردن زیو بێت ئەوا بێدەنگی ئاڵتوونە، یان پێشینان وتەنیش: خودا دوو گوێ و یەک زمانی بە مرۆڤ بەخشیوە.

- کوڕەکەم؛ مرۆڤەکان بە دوو چاو و یەک زمان لە دایک دەبن؛ تاکو دوو هێندەی ئەو شتەی دەیڵێن ببینن.

- کوڕی خۆم؛ ئەوە بزانە دنیا گەورەیە و مرۆڤیش بچووک، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگای چاکەکاری و عیبادەت و گوتنی زیکری خودا وەها گەورە ببێتەوە کە جیهان لە ئاستیدا بچووک بێت، هەڵبەت بە چاکەکاری و زیکری خودا.

- ئەگەر دەتەوێت لە لای خەڵک و خوا خۆشەویست و گەورە بیت، دەبێت عەقڵت بەسەرتدا زاڵ بێت و، بێ فەرمانی عەقڵ و ڕاوێژکردن بە خوا دەست بۆ هیچ کارێک نەبەیت.

- کوڕم وریابە! وەک چۆن غەم و مەراق ڕۆح دەفەوتێنێت، زۆربڵێییش دەتوانێت لەبەرچاوی خەڵک سووکت بکات.

- کوڕەکەم وریا بە! هەرگیز فەرامۆشی مەکە کە مرۆڤەکان دوو گوێیان هەیە و زمانێک، کەواتە دەبێت دوو هێندەی ئەو شتەی باسی دەکەن، ببیستن.

- مەبەستی سەرەکی لە ژیان فێربوونی زانست نییە، بەڵکو ئەنجامدانی ئەو شتانەیە وا فێریان بووین.

- کوڕی خۆشەویستم؛ ئەوە بزانە کە هەتاو گەرما و ڕووناکیی خۆی بە ڕووەکێک دەبەخشێت کە سەری لە خاک دەرهێنابێت. کەواتە تۆش تەنیا کاتێک دەتوانیت سوود لە ڕووناکی و ئارامیی خودا ببینیت کە بیر و ڕۆحی خۆت لەم زەوییە خاکییە بهێنیتە دەرەوە و، بیر لە دنیای ماددی نەکەیتەوە.

- کوڕی خۆم وریا بە! ئەگەر خەڵک نەتناسن کێشە نییە، بەڵام ئەگەر تۆ خەڵک نەناسیت دەبن بە هۆی خەم و مەراق و دۆڕانی تۆ.

- کوڕم؛ خودا بەردەوام لە ڕێگای زمانە جیاجیاکانەوە مرۆڤەکان بەرەو چاکەکاری و زیکری خودا و ڕێنوێنی خەڵک ڕێنوێنی دەکات، کەواتە کوڕم تۆش هەموو کێشەکانت یەک بە یەک بسپێرە بە دەستی خودا و، خۆت بە زیکری خوداوە سەرقاڵ بکە، تاکو خودا ڕێگای ڕزگاربوون لە کێشەکانت پیشان بدات.

- کوڕی ئازیزم؛ ئەو کاتانەی تۆ لە ناو بیر و ئەندێشەی خۆتدا هەوڵی ناسینی خودا دەدەیت؛ خوداش بارودۆخێکت بۆ دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بتوانیت باشتر خودا بناسیت.

- کوڕم؛ ڕەنجبردن بەشێکە لە ژیان و وانەت فێر دەکات، ئەگەر ڕەنجت بە نەسیب نەبێت ناتوانیت فێری باشترین وانەکانی ژیان بیت، بەڵام مخابن زۆربەی مرۆڤەکان لەم ڕاستییە تێ ناگەن.

- کوڕی خۆم تۆ ناتوانیت لە ڕێگای فەلسەفەوە خودا بناسیت، بەڵام لە ڕێگای بیرکردنەوە لە ئافرێنراوەکانی خوداوە دەتوانیت بگەیت بە تێگەیشتن و بڕوایەکی تەواو و، تێدەگەیت کە خودا وڵامی هەموو پرسیارە ڕۆحییەکانتە.

- ئەوەش بزانە کە خودا داوای کارێکت لێ ناکات کە لەبەر شانت قورسە و پێت ناکرێت، بەڵام تۆ خۆت دەبێت لە ڕێگای زیکر و ڕێنوێنیکردنی خەڵکەوە خۆت بگەیەنیت بە ئاستێکی باڵا.

- زۆرێک لە خەڵک پێیان وایە هێندە خراپ و گوناهکارن کە ناتوانن لە خودا نزیک ببنەوە، بەڵام خودا زۆر بەخشندە و میهرەبانە. تەنانەت میهرەبانترە لە دایک.

- بۆ گەیشتن بە ئاسوودەیی دەبێت لە هەموو کارەکانی ژیانتدا بە پێی داهاتی ڕۆژانەت ڕێژەیەک پارە پاشەکەوت بکەیت، تاکو بۆ سەردەمی پیری و لاوازیت بتوانیت بە ئاسوودەیی بژیت. هەروەها ئەگەر ئێستا لە ئاسوودەیی و دەوڵەمەندیدا دەژیت هەوڵ بدە هەندێک پارە پاشەکەوت بکەیت بۆ کاتی پیریت، چونکە توانایی و هێزی مرۆڤەکان وەکو هەتاوی بەرەبەیان لە تەواوی سەعاتەکانی ڕۆژدا پایەدار نییە.

- کورم وریابە! سەبارەت بە داهاتووت بە فیزەوە قسە نەکەیت، چونکە نازانیت لە داهاتوودا چی ڕوودەدات. هەروەها هەرگیز وەسفی خۆت مەکە و تا پێت دەکرێت هەوڵ بدە بە چاکەکردن وا لە خەڵک بکەیت ئەوان وەسفی تۆ بکەن.

- کوڕی خۆم زۆر بیربکەرەوە و کەم قسە بکە مەگەر لە ووتنی ڕاستیدا نەبێت، زۆر بگری و کەم پێبکەنە.

- کوڕی خۆم گاڵتە و سوعبەت زۆر مەکە و قیزە قیژ مەکەو دەمەقاڵێ زۆر مەکە، هەر کاتێک بێدەنگ بووی با بێدەنگیەکەت بیرکردنەوە بێت، هەرکاتێکیش قسەت کرد بە دانایی قسەبکە.

- کوڕی شیرینم ماڵەکەت بە فیرۆ مەدەو ماڵی خەڵکیش بە چاک مەزانە، ماڵی خۆت ئەو ماڵەیە کە لەپێش خۆتدا بەڕێی دەکەیت و ماڵی خەڵکیش ئەو ماڵەیە کە لەدوای مردن بەجێدەهێڵرێت.

- ئەی کوڕی شیرینم هەموو هەوڵێکت لە چاکەدا با بەزۆر لەخۆ کردن بێت و هەرگیز نەڵێی بەسە.

- کوڕی خۆم ئەوەندە گرنگی بە دنیا مەدە کە ئاگات لە خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوای نەمێنێت.

- کوڕم؛ تۆ لەناو بیر و هزری خۆت و لە کاتی زیکری خودا داوا لە خودا بکە و بڵێ: خودایا عەقڵ و ئەندێشەم نوورانی بکە تاکو لە ڕێگای ڕاستی ژیان تێبگەم و، دڵێکم پی ببەخشە تاکو میهرەبانی و چاکە و ڕاستی بە مرۆڤەکان ببەخشم.

- کوڕم؛ بڵێ: خودایا بارانی بەخششی نوورانییەت بە سەر عەقڵ و ئەندێشەمدا ببارێنە و، لە کاتەکانی تەنیاییمدا ببە بە هاودەم و هاوڕێ و هاونشینم.

- کوڕی خۆشەویستم؛ گوتنی زیکری خودا لە ڕێگای فیکر و ئەندیشەوەیە. داوا لە خودای گەورە بکە و پێی بڵێ: ئەی خودای عالەمیان و، ئەی میهرەبانترینی میهرەبانان، بە یادی خۆت ساتە ناوازەکانی گەنجیم نوورانی بکەوە و، لە هەر بەرزی و نزمییەکدا و، لە هەموو ساتەکانی ژیاندا یارمەتیم بدە.

- کوڕم وریابە! هەر کاتێک ویستت ژن بهێنیت هەوڵ بدە زانیاری تەواو لەسەر ئەو کەسە بەدەستبهێنیت کە دەتەوێت لەگەڵی بژیت و، هێندە باش بیناسیت کە ژیانی هاوبەش لەگەڵ ئەو چێژبەخش بێت بۆت. هەروەها ژنێک بێنە کە لە هەموو لایەنەکانەوە لە تۆ بچێت و، هەموو تایبەتمەندییەکانی لە پێش چاوی خۆت و خەڵکەوە پەسەند بێت. هاوسەری باش و ژیر و لەخواترس باشترین یاری ژیانە.

- کوڕم؛ بڵێ: ئەی خودای دوورخەرەوەی خەمەکان تەنیا هانا بۆ تۆ دێنم، لە شەڕی بێ فکری و هەڵەکانم. ئەی ڕووناککەرەوە، ساتەکانی گەنجیم بە بیرکردنەوە و عەقڵ و ئەندێشەی باڵا بەرز ڕووناک بکەوە.

- کوڕم؛ کاتێ ڕۆدەچێتە ناو قووڵایی بێدەنگییەوە جوانی و ئارامیی ڕۆح ئەزموون دەکەیت و، کاتێک دەچیتە قووڵایی بێدەنگی و زیکری خوداوە هەموو ترسەکانت لەناو دەچن و، گوتنی زیکری خودا لەناو بێدەنگیدا لە ڕادەبەدەر جوانە.

- کوڕم؛ ئەوە بزانە ئەگەر بە درێژایی تەمەنت بێدەنگ بیت و خەڵک داوات لێ بکەن قسەیان بۆ بکەیت؛ باشترە لەوەی بەردەوام قسە بکەیت و قسەکانیشت بێهودە بن و، خەڵک ئازار بدەیت و، خەڵک داوات لێ بکەن بێدەنگ بیت،

- کوڕی خۆم؛ هیوا نیوەی بەختەوەرییە. ئومێدەواری و هیوا لە کار و ژیاندا زۆر گرنگە و، لە باڵی باڵندە دەچێت کە چەند بۆ فڕین پێویستە. ئومێد و ئومێدەواری بەخشش و نیعمەتێکی گەورەیە.

- کوڕەکەم؛ هەوڵ بدە هەرگیز خێرا و بە پەلە قسە نەکەیت و، بەردەوام بە نەرمییەوە بدوێیت. کەسێک کە بە نەرمی و هێمنی قسە دەکات هەم خۆی لە ئاسوودەییدایە و، هەم خەڵک دەخاتە ئاسوودەیی و متمانەوە.

- کوڕی خۆم؛ هیچ چارەیەک بۆ لەدایکبوون و مردن نییە؛ کەواتە باشترە بە درێژایی ژیان باشترین کەڵک لە کات و تەمەنی خۆت وەربگریت. ئەم دنیایە فانییە و زوو کۆتایی پێدێت، دواجار هەر ڕۆژێک کۆتایی پێدێت. دەوڵەمەند بیت یان نا هیچ جیاوازییەکی نییە.

- کوڕی خۆم خۆت بەجۆرێک رابێنە کارەکانت خۆش بوێ ئارامبگرە لەسەر تاڵیەکانی.

- کوڕەکەم با لەگەڵ هەموو خەڵکیدا ڕەوشتت جوان بێت، چونکە ئەگەر کەسێک ڕەوشتی جوان بێت و ڕووی خۆش بێت لای چاکان خۆشەویست دەبێت و خراپانیش لێی دوور دەکەونەوە.

- کوڕی خۆم لەکاتی تورەییدا بە سام بە و لە کاتی ناخۆشیدا شادمان بە و لەکاتی خۆشیدا سوپاس گوزاربە و لەکاتی نوێژدا ملکەچ بە و لە چاکە کردندا پەلە بکە.

- کوڕی خۆم کاتەێک دەسەلات هانیدای ستەم لە خەڵکی بکەی بیری دەسەلاتی خوات بکەوێتەوە بەسەرتا و ئاگات لە سزای خودابێت وە سزاکەشی هەمیشەییە و کۆتایی نایەت.

- کوڕی خۆم خۆت لەتەماح بپارێزە چونکە تەماح هەژارییەکی ئامادەیە.

- کوڕی شیرینم خۆت لە تووڕەیی بپارێزە چونکە تووڕەیی دڵی پیاوی دانا لەناو دەبات، خۆت لە خۆشگوزەرانی زۆر بپارێزە چونکە لێپرسینەوەی سبەینێت قورس دەبێت.

- کوڕی خۆم خۆت لە درۆ بپارێزە چونکە ئاینت تێک دەدات و شەخسیەتت لەلای خەڵکی ناهێڵێت، جا ئەوکاتە شەرم و جوانی و سامانت نامێنێ و ڕسوا دەبیت و کاتێک قسەدەکەی کەس گوێت لێناگرێ و باوەڕیشت پێناکەن، خێرو خۆشیش لە ژیانێکدا نیە ئەگەر بەم شێوەیە بێت.

- کوڕی شیرینم خۆت لە دەمەقاڵێ بپارێزە چونکە ئاشوبەکەی متمانە پێنەکراوە و داناییەکەشی نابەستریتەوە.

- کوڕی شیرینم دنیا بە دوارۆژت بکڕە لە هەردووکیان قازانج دەکەی، دوارۆژت بە دنیا مەکڕە لەبەر ئەوەی لە هەردوکیاندا زەرەر دەکەی.

- کوڕی ئازیزم فێری چاکە ببە و خەڵکیش فێربکە.

- کوڕی خۆم ئەوکەسەی درۆت بۆ بکات لێی دڵنیا مەبە، درۆشت بە دەمەوە دەکات.

- کوڕی ئازیزم لە کۆڕ و کۆبونەوەدا لە شوێنی بەرز دامەنیشە، چونکە شوێنی نزم چاکترە بۆت وەک لە شوێنی بەرز.

- کوڕی ئازیزم کاری بچووک بە کەم مەزانە، چونکە هەر کاری بچووکە سبەینێ گەورە دەبێت.

- کوڕی خۆم داوای پێویستی لەکەسی خوار خۆت مەکە چونکە ئەگەر شتێکت بداتێ منەت دەکات بەڵکو هەر داوا لە خودا بکە چونکە خودا پێی خۆشە کەسێک داوای لێبکات، ئەگەر کەسێکیش داوای لێنەکات لێی تورە دەبێت.

- کوڕی ئازیزم هەرکەسێک ڕاوێژ نەکات پەشیمان دەبێت، هەرکەسێک هاوڕێیەتی کەسی خراپ بکات سەلامەت نابێت، هەرکەسێک بچێتە شوێنی نەشیاو تۆمەتی بۆ دروست دەکرێت، هەرکەسێک ڕقی لە خراپە بێت دەپارێزرێت، هەرکەسێک چاکە بکات سوپاس دەکرێت هەرکەسێک ڕەحمی نەبێت خوداش ڕەحمی پێناکات.

- کوڕی خۆم داوای کۆتایی کار مەکە و سەرەتاکەشی ڕەت مەکەرەوە، چونکە ئەوە بۆچوون کەمدەکاتەوە.

- کوڕی ئازیزم سەرسام مەبە بە چاکەکانت ئەگەرچی زۆریش بێت چونکە تۆ نازانی ئایا خودای گەورە لێی وەرگرتوی یان نا.

- کوڕی شیرینم زۆر خەڵک سەرقاڵ مەکە و مافیشیان بدە، ستەمکار مەبەو خۆشت لەپاڕانەوەی ستەملێکراو بپارێزە.

- کوڕی ئازیزم چاو مەبڕە جوانی و ڕازاوەیی دنیا داوای هەموو جوانییەکیش مەکە لە دنیا با هیمەتت لەو شتانەدا بێت کە لە خودای گەورەت نزیک دەکاتەوە.

- کوڕی شیرینم لەو زانستەی هەتە نەزانی پێ فێر بکە لەسەرو زانیاری خۆشتەوە بەدوای زانستی زانایان بکەوە و هاوەڵێتی نەفام مەکە ئەگینا وەک و ئەوت لێدیت.

- کوڕی خۆم دڵخۆش مەبە بە ماڵێک ئەمڕۆ تیایدا زیندوویت و سبەینێ دەمریت و بەجێی دێڵیت.

- کوڕە ئازیزەکەم دەمەقاڵێ لەگەڵ دانا مەکە، دەمەقاڵێ لەگەڵ ڕۆچوودا مەکە، لەگەڵ ستەمکاردا مەژی هاوەڵێتی گومانلێکراویش مەکە.

- کوڕەکەی لوقمان بە باوکی ووت: کێ دەوڵەمەندترین کەسە ؟ دەڵێن کەسێک دەوڵەمەندە ماڵ و سامانی زۆر بێت ؟ لوقمان یش پێی ووت: نا کوڕەکەم بەڵکو دەوڵەمەندی لە زانستدایە ئەگەر پێویستی بوو دەستی دەکەوێت و ئەگەر لێی بێنیاز بوو خۆی بەسە.

- کوڕی خۆم با گومانی خراپ بەسەرتا زاڵ نەبێت چونکە لەنێوان تۆ و خۆشەویستەکەتدا چاکسازی ناهێڵێت.

- کوڕی خۆم لەگەڵ نەفامانددا دامانیشە و هەرگیز تێکەڵاوی دوو ڕوو مەبە.

- کوڕی شیرینم هەرکەسێک دایک و باوکی لە خۆی ڕازی بکات خودای خۆی ڕازی کردووە، هەرکەسێکیش دایک و باوکی لەخۆی تورە بکات خودای لەخۆی تورە کردووە.

- کوڕی شیرینم هەرکەس پشت بە خودا ببەستێ و بە قەزاوقەدەر ڕازی بێت ئەوە ئیمان و باوەڕی جێگیر کردووە و خۆی یەکلایی کردۆتەوە بۆ چاکە.

- کوڕم ئەقڵی خەڵکی بۆ خۆت بەرە کوڕەکەی ووتی: چۆن؟ لوقمانی حەکیم فەرمووی: لە کارەکانتدا ڕاوێژیان پێبکە.

- کوڕە نازدارەکەم هەرکاتێک خراپەیەکت کرد چاکەیەک بە دوایدا بکە، ئەگەر خەڵکی شانازیان بە جوانی قسەکردنەوە کرد تۆ شانازی بە بێدەنگییەوە بکە.

- کوڕەی ئازیزم کاتێک فەرمانیان پێکردی و پرسیاری شتێکیان لێکردی بڵێ بەڵێ مەڵێ نەو چونکە ئەوە نەزانی و ڕوشدییە.

- کوڕی ئازیزم ئامۆژگاریت دەکەم بە چەند شتێک کە لە خودات نزیک دەخاتەوە و لە تورەییەکەی دوورت دەخاتەوە:

یەک: خودای پەروەردگار بپەرستە و هیچ هاوبەشێکی بۆ دامەنێ.

دوو: ڕازیــبە بە قەدەری خــودا لە هەرچــی پێــت خۆشـــە و پێــت ناخۆشە.

- کوڕی خۆم کاتێک پێویستت بە دەسەلاتدارێک بوو زۆری لێمەکە و داواشی لێمەکە مەگەر لەکاتی شێنەیی و دڵخۆشیدا.

- کوڕی خـۆم داوای یـارمەتی لەکەسـێک مەکە کە فێڵت لێدەکات و داوای هیچــیش لەچــرووک مەکە چــونکە ئەگەر نەتــداتێ پێــنەدانەکەی عەیب و شورەییە بۆت خۆ ئەگەر بشتداتێ منەت دەکات بە سەرتدا.

- کــوڕی ئـازیزم چــاکە بـکە و خـراپە مەکە بەڕاسـتی کەسـی چـاک چاکە ئەنجام دەدات و کەسی خراپیش خراپە ئەنجام دەدات.

- کوڕی ئازیزم ئامۆژگاری وەربگرە ئەگەرچی لەسەریشت قورس بوو.

- کوڕی شیرینم هاوار بۆ ئەو کەسەی گوێ دەگرێ گوێگرتنەکەی سـودی بـۆی نـیە ، هـاوار بـۆ کەسـێکیش زانسـت فێربـووە و سـودی پێناگەیەنێت، هـاوار بـۆ کەسـێکیش گـومڕایە و گـومڕایی بەسـەر ڕێـی ڕاستدا هەڵبژاردووە.

-کوڕی خۆم بەڕاستی دانایی هەژار دەکات بە پاشا.

- کوڕی ئازیز و بیلبیلەی چاوم تاڵی و سوێری زۆرم چەشتووە بەڵام لە هەژاری تاڵترم نەچەشتووە، ئەگەر هەژار بووی با خەڵکی باست نەکەن و بە کەمت بزانن بەڵکو داوای بەخشش لە خودا بکە کێ هەیە داوای لە خودا کردبێ و پێی نەبەخشی بێت یان لێی پاڕابێتەوە و وەڵامی نەدابێتەوە یان هانای بۆ بردێ و بە دەمیەوە نەچووبێ.

- کوڕی شیرینم دایک و باوک دەرگایەکن لە دەرگاکانی بەهەشت ئەگەر لێت ڕازی بوون دەچیتە بەهەشتەوە ئەگەر لێشت تورە بوون بێ بەش دەبیت لە بەهەشت.

- کوڕی شیرینم پەنا بگرە بە خودا لە شەڕی خراپە و لەشەڕی قەزاوقەدەر.

- کوڕی شیرینم بە ڕەزامەندی خودا خەڵکی لەخۆت تورە بکە.

- هەرکەسێک ئامۆژگاری خۆی بکات خودای گەورە دەیپارێزێت.

- هەر کەسێک خۆی لە خەڵکی بە بچووکتر بزانێت خودای گەورە بە هۆی ئەوەوە سەربەرزی دەکات.

- زەبـونی لە گـوێڕایەڵی خـودای گەورەدا چـاکترە لە سـەربەرزی لەسەرپێچی خودای گەورەدا.

- هەر کەسێک درۆبکات ئاوی دەمووچاوی نامێنێت و کەسێکیش ڕەوشتی ناشرین بێت خەم و خەفەتی زۆر دەبێت.

- بێدەنگی داناییە بەڵام کەم کەس جێبەجێیدەکات.

- بەڕاسـتی ئەگەر بـاوەڕدار سـەیری سـەرەنجامی کارەکـانی بکـات پەشیمان نابێت.

- ئامۆژگـاری لەسـەر نەفـام قورسـە هەر وەک سـەرکەوتنی پیـری بەتەمەن بەسەر شاخ و بەردەلاندا.

- بەڕاستی مرۆڤی دووڕوو لەلای خودا بێوەی نابێت.

- هەرکاتێک خـودای گەورە بیەوێت خـراپە لەنـاو نەتەوەیەکدا بـڵاو ببێتەوە دەمەقاڵێ لەنێوانیان بڵاو دەبێتەوە و کردەوەیان کەم دەبێت.

- هاوەڵ سێ جۆرە، فێڵباز، پێزان، بە تەماح، فێڵباز ئەوەیە کە چاکەی لەگەڵ دەکەیت و پاداشتت ناداتەوە، پێزان ئەوەیە کە چاکەی لەگەڵ دەکەی پاداشتت دەداتەوە، بە تەماحیش ئەوەیە کە بەبێ هیچ مەبەستێکی دنیایی حەزدەکات بتبینێت.

- کاتێک قسەت کرد لە کورتی ببڕەوە، کاتێکیش پێویستیەکەت جێبەجێ کرد قسە مەکە.

- فێڵی دڵ بە قسەکردن لەسەر زمان یان بەبینین لە چاودا دەردەکەوێت.

- لەگەڵ گێلدا مەژی ئەگەرچی دەوڵەمەنیش بێت.

- سەیری شمشێر بکە دیمەنەکەی چەند جوانە و ئازارەکەی چەند سەختە.

- بەڕاستی قسە هەیە ڕەق ترە لە بەردو تیژترە لە دەرزی و تاڵترە لە ئارامگرتن و گەرمترە لە پشکۆ، چەندین دڵ هەیە کێڵگەی هەیە تۆش لەو کێڵگەیەدا قسەی باش بڕوێنە ئەگەر هەمووشی نەڕوێت هەندێکی دەڕوێت.

- نەمبینیوە قورسستربێت لەو ووتە خراپەی لە دڵدا جێگیر دەبێت وەک جێگیربوونی ئاسن لە ئاودا.

- دەگێڕنەوە دوای ئەوەی خودای گەورە دانایی بە لوقمانی حەکیم دا، پیاوێک کە پێشتر دەیناسی بینیەوە پێی ووت: تۆ تا دوێنێ لای گەورەکات شوانی مەڕ بوویت ئەی چی تۆی گەیاندە ئەو پلەو پایە ووتی: قەدەری خوداو بەجێهێنانی سپاردە و ڕاستگۆیی لە قسەکردندا و بێدەنگ بوونم لەشتێک کە پەیوەندی بە منەوە نەبێت.

- پیاوێک تەماشای لوقمانی دەکرد ئەویش پێی ووت: ئەگەر بۆ ئەوە سەیرم دەکەی کە دوو لێوی ئەستورم هەیە ئەوا لەنێوانیاندا ووتەی نەرم و نیان دەردەچێت ئەگەر بۆ ئەوەش سەیرم دەکەی کە ڕەش پێستم ئەوا دڵم سپییە.

- بە لوقمان ووترا چی تۆی گەیاندە ئەو پلە و پایە ؟ ووتی: بە وازهێنانم لەو شتانەی پەیوەندییان بە منەوە نیە.

- کوڕەکەی لوقمان بە باوکی ووت: باوکە چ ڕەوشتێک بۆ مرۆڤ چاکە؟ ووتی: ئاین و سامان، ووتی: ئەی ئەگەر سیان بوو ؟ ووتی: ئاین و سامان و شەرم.

ووتی: ئەی ئەگەر چوار بوو؟

ووتی: ئاین و سامان و شەرم و ڕەوشتی جوان.

ووتی: ئەی ئەگەر پێنج بوو؟

ووتی: ئاین و سامان و شەرم و ڕەوشتی جوان و بەخشندەیی.
ووتی: ئەی ئەگەر شەش بوو؟

ووتی: کوڕی خۆم هەرکەسێک ئەم پێنج شتەی لە خۆیدا کۆ کردەوە ئەوا پاک و پارێزگار و دۆستی خوایە و لە شەیتانیش پارێزراو ئەبێت.

- بە لوقمانی حەکیم ووترا: کێ ئارامگرتین کەسە؟

ووتی: ئارامگرتنێک ئازاری بەدوادا نەبێت، ووترا ئەی کێ زاناترین کەسە؟ ووتی: کەسێک کە زانستی خەڵکی بخاتە سەر زانستی خۆی، ووترا: کێ چاکترین کەسە؟ ووتی: دەوڵەمەند!، ووترا: دەوڵەمەندی لە ساماندا ؟ ووتی: نا ئەو دەوڵەمەندەی کاتێک داوای چاکەیەکت لێکرد لەلای ئەو دەستت بکەوێت ئەگەر نا خۆی بێ نیاز بکات لە خەڵکی.

- ئیبن حەریر دەڵێت: لوقمانی حەکیم کۆیلەیەکی حەبەشی بوو پیشەی دارتاشی بوو، جارێک گەورەکەی پێی دەڵێ ئەم مەڕەمان بۆ سەر ببڕە پاشان ئەویش سەری دەبڕێت، ئنجا دەڵێت چاکترین گۆشتم بۆ دەربێنە پاشان ئەویش زمان و دڵەکەی بۆ دەر دەکات، پاش ماوەیەکی تر پێی دەڵێ ئەم مەڕەمان بۆ سەر ببڕە پاشان ئەویش سەری دەبڕێت، ئنجا پێی دەڵێت خراپترین گۆشتم بۆ دەربێنە دووبارە ئەویش زمان و دڵەکەی بۆ دەر دەکات.

ئنجا گەورەکەی پێی دەڵێت فەرمانم پێکردی چاکترین گۆشتم بۆ دەربێنی زمان و دڵەکەیت بۆ دەرهێنام، جاری دووەم فەرمانم پێکردی خراپترین گۆشتم بۆ دەربێنی دووبارە زمان و دڵەکەیت بۆ دەرهێنام، ئەویش دەڵێت: هیچ شتێک نیە چاکتربێت لەو دوانە بە مەرجێک خاوەنەکەی پاک ڕایبگرێت هیچ شتێکیش نیە پیستر لەو دوانە ئەگەر خاوەنەکەی پیسی بکات.

- له خەڵکی خراپ دووربکەونەوە با دڵتان ساف بێت و لاشەتان ئاسودەبێت و دەروونتان ئارام بێت.

- دیدار و گەیشتن بە پیاوچاکان ئاوەدانی دڵانە، دڵ بە ووتەی دانایی زیندوو دەبێتەوە هەروەک چۆن زەوی بە بارانی پەڵە زیندوو دەبێتەوە.

- جارێک لوقمان دەچێتە خزمەت پێغەمبەر داود (س.خ) دەبینێت وا داود خەریکی چاکردنی زرێپۆشەکەیەتی، لوقمان نەیزانی داود خەریکی چیە وویستی پرسیاری لێبکات بەلام لە دڵی خۆیدا ووتی بە پەلە نەکەم ماوەیەک چاوەڕێی کرد تا داود زرێپۆشەکەی چاک کرد و لەبەری کردو ووتی: بەخوا زرێپۆشێکی چاکە و بەکەڵکی جەنگ دێت و دەمپارێزێت، ئنجا لوقمان زانی کە شتەکە چی بوو بۆیە بە داودی ووت: بێدەنگی زێڕە و بەشێکە لەدانایی وویستم پرسیارت لێبکەم بەلام خۆم گرت تا خۆت بۆت باس کردم و فێربووم.

- جارێک لوقمان بە دەنکە خەردەلەیەک ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد تا خەردەلەکە نامێنێت و لەناو دەچێت پاشان دەڵێت کوڕی خۆم ئامۆژگارییەکم کردی ئەگەر ئامۆژگارییەکە بۆ شاخێک بوایە ئەوا شاخەکە لەت دەبوو پاشان دوای ئەمە کوڕەکەی مرد.

- دەگێڕنەوە کە لوقمانی حەکیم سەردانی عەنتەرەی کرد لە وولاتێکی تر پێی ووت: تۆ عەنتەری؟ تۆ ئازاترین خەڵکی ئەم سەردەمەی ؟ ئەتوانی ئازایەتیم فێربکەی؟، عەنتەر ووتی: پەنجەت بخەرە ناو دەمم و منیش پەنجەم دەخەمە ناو دەمتەوە، هەریەکەیان لە یەک کاتدا پەنجەی یەکتریان گەست، لوقمان یەکسەر هاواری لێ هەستا، عەنتەرە ووتی: ئەگەر تۆ هاوارت نەکردایە من هاوارم دەکرد، ئەوە ئازایەتیە کەمێک خۆگربێت تا دوژمنەکەت خۆگری نامێنێت.

پاشان عەنتەرە بە لوقمانی ووت: تۆ دانای سەردەمیت ئایا دەتوانی فێری دانایم بکەی؟

لوقمان ووتی: پەنجەت بخەرە ناو دەممەوە، پەنجەی خستە دەمیەوە لەقمان خێرا پەنجەی گەست، عەنتەرە کەوتە هاوارکردن لوقمان ووتی: ئەگەر کەمێک بیرت هەبوایە دەتزانی کە من دەستت دەگەزم و ئازارت ئەدەم ئەوکاتە وا بە ئاسانی پەنجەت نە ئەخستە ناو دەمم، بەڕاستی ئەمە داناییە پێش ئەوەی بچیتە ناو بیرەوە دەبێت بزانیت چۆن دێیتە دەرەوە.

- چی بچێنیت ئەوە دە دووریتەوە، هەروەک چۆن دوژمن بە پەیوەندی بەستن دەبێت بە دۆست، دۆستیش بە پەیوەندی پچڕان دەبێتە دوژمن.

- ببە بە بەندەی چاکان و مەبە بە دۆستی خراپان هەروەک چۆن لەنێوان گورگ و مەڕدا دۆستایەتی نیە بەو شێوەیە لەنێوان چاکەکار و خراپەکاردا دۆستایەتی نیە.

- دەوڵەمەند بەبێ ترس دەنوێت.

- نەرم و نیانی سەرچاوەی هەموو داناییەکە.

- داپۆشینی ئەوەی چاودێریت کردووە باشترە لە بڵاوکردنەوەی ئەوەی گومانم پێ بردووە.

- پرسیار نیوەی وەڵامە و گونجان لەگەڵ خەڵک نیوەی ئەقڵە.

- گەورەی ڕەوشتەکانی دانایی ئاینی خودای گەورەیە.

- ڕوشدی و ڕەوشت ناشرینی و زۆر داوای شت لە خەڵکی کردن نیشانەی نەفامانە.

- کەسی بەڕێز کە زوهدی بوو خۆی بە بەڕێز دەزانێ و کەسی بێڕێزیش کە زوهدی بوو خۆی بەگەورە دەزانێت.

- ئارامگرتن دوو جۆرە ئارامگرتنێک کە پێت ناخۆشە لات دەدات لە هەق ئارامگرتنێکیش کە پێت ناخۆشە ئارەزوو بۆلای خۆی بانگت دەکات.

- لێدانی باوک بۆ منداڵ وەک پەین وایە بۆ کێڵگە.

- خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی بە دنیا هەڵنەخەڵەتا و لە ڕۆژی دوایشدا پەشیمان نابێتەوە.

- ڕووخۆشی و دەرخستنی خۆ بەکەمزانین و سڵاوکردن و مامەڵەی جوان و وازهێنان لە گوناه دەبنە هۆی خۆشەویستی لەناو خەڵکیدا.

- ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتییەکان لە جوانی یەقینەوەیە، هەموو کارێکیش تەواوی و مەبەستی خۆی هەیە، تەواوی پەرستش وەرع و یەقینە مەبەستی گەورەیی و بەرزیش ئەقڵی جوانە، هەرکەس ئەقڵی جوان بێت ناتەواوییەکانی دا دەپۆشێ و خراپەکانی چاک دەکات و خودا لەخۆی ڕازی دەکات.

- خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی سود لە زانستەکەی دەبینێ و گوێ لە قسە دەگرێ و شوێن چاکترینیان دەکەوێ.

- قسە نەزانین نیشانەی کەم ئەقڵیە، جا تەماشا بکە بزانە چی دەڵێیت.

- هەرکەس چاکەکانی بژمێرێت بەخشندەیی نامێنێت.

- هەرکەس حەزی لە دەمەقاڵێ بێت جوێنی پێدەدرێت.

- جارێک لوقمانی حەکیم بینرا لەدوای دزێکەوە دەڕۆیشت پێیان ووت: ئەی دۆستی خودا ئەوە لە دوای ئەو بێباوەڕەوە دەڕۆی؟

ووتی: بەڵێ بەڵکو داوای لێبکەم باوەڕبێنێ و ڕزگاری ببێ.

- دەگێڕنەوە ماڵی لوقمانی حەکیم سادەترین ماڵ بوو لە ماڵی جاڵجاڵۆکە سادەتر بوو، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا لە وەڵامدا ووتی: ئەوە زۆرە بۆ کەسێک کە بمرێت.

- ڕۆژگارێک بەسەر خەڵکیدا دێت کە چاوی پیاوی دانا تیایدا ڕوون نابێت.

- هەموو بەیانیان و ئێوارانێک زمان بە ئەندامەکانی تر دەڵێت: ئێوە چۆنن؟ دەڵێن: ئێمە باش دەبین ئەگەر تۆ وازمان لێبێنی.

- پێویستە پیاوی ژیر لە ماڵەوە وەک منداڵ و لە دەریشەوە وەک پیاو خۆی پشان بدات. خودای گەورە ئێسکی ئەوانە دەڕزێنێت کە بە ئارەزووی خەڵکی قسە دەکەن.

- هەر خۆشییەک یا ناخۆشییەک کە دێتە ڕێت لەدڵی خۆتدا بە شتێکی چاکی بزانە.

- هیچ شتێک ماندووکەرتر نیە بۆ لاشە لە شتی پڕوپوچ.

- هەرچی دەشاریتەوە لە دوژمنەکەت بۆ دۆستەکەتی ئاشکرا مەکە.

- نمـونەی کەسـی گێـل وەک جلـی کـۆن وایە، کاتێـک لایەکـی دەدورێـتەوە لە لایەکـی تـرەوە دەدڕێـت و وەک شوشــە وایە یەک ناگرێتەوە.

- کـوڕی شـیرینم؛ گـوێ لە ئامۆژگارییەکـانی باوکـت بگـرە و، سـەرنجیان پێبـدە بـۆ ئەوەی ژیـر بیـت، کـوڕم؛ لەبیـرت بێـت کە ئامۆژگارییەکانم بەسوودە، سەردەمانێک منیش گەنج بووم و جگە لە خوا هیچ پشت و پەنا و پشتیوانێکم نەبوو. تەنیا خواوەند ئامۆژگاری دەکـردم. کـوڕی خـۆم، ئەگەر وتەکـانم ببیسـتیت و بە کردەیـی جێبەجێیان بکەیت؛ ئەوا بە زیندووی دەمێنیتەوە. کەواتە تا دەتوانیت ڕاستکردار و خۆپارێز بە. وتەکانم لەبیر مەکە و گومڕا مەبە. هەڵبەت وتەکانم سروش و ئیلهامی خواوەندە کە بۆ ئەندێشە و مێشکی من وەحـی کـراوە. هەوڵبـدە لە وتەکـانم پەنـد و وانەی ژیـان فێرببیـت. کوڕەکەم، خواناسی و لە خواترسی لە هەر شـتێکی ئەم دنیا خـاکی و تێـپەڕە باشـترە. خواناسـی و لە خواترسـیت خۆشـبوێت، چـونکە پارێزگاریـت لێـدەکەن، هەوڵ بـدە بە هەر نرخێـک دەتوانیـت وانەی خواناسی فێرببە ،و بایەخ بۆ خواناسی و ڕاستکرداری دابنێیت چونکە لای بەهشـتییەکان و مرۆڤەکـان سـەربڵند و سـەرکەتووت دەکـات و، تاجی شانازی و سەربڵندیت دەکاتەسەر.

- دەمەقاڵێ کلیلی ڕق و کینەیە، ڕق و کینەش کلیلی گوناهە.

- چاکە گەنجینەیە، تەماشا بکە بزانە بەکێ دەسپێردرێت.

- بە لوقمانی حەکیم ووترا: کێ زاناترین کەسە ؟ ووتی: کەسێک زانست لەخەڵکی وەربگرێت.

- با هەزار دۆستت هەبێت هەرچەندە هەزاریش کەمە، با یەک دوژمنیشت نەبێت هەرچەندە یەک دووژمنیش زۆرە.

- چاکە لەشوێنی شایستەی خۆی بکە، لە شوێنی نا شایستە دای مەنێ چونکە بەهۆی ئەوەوە لە دنیادا زەرەر دەکەیت و لە پاداشتی دوارِۆژیش بێبەش دەبیت.

- پشت بە خودا بەستن چاکترین شتە، کەم ئەرک خستنە سەر خەڵکی ئەوپەڕی وورەییە.

- خۆت له هاوڕێیەتی درۆزن بپارێزە، ئەگەر هاناشی بۆهێنای باوەڕی پێمەکە، باوا نەزانێت کە تۆ بە درۆزنی دەزانیت چونکە ڕقت لێهەڵدەگرێت، خوی ئەویش مەگرە.

- زیرەکترین کەس ئەوەیە ئەنجامی کار بزانێ و خۆی لێ بپارێزێ.

- چاکترین کەس لە پیاوەتی و ڕەوشتدا کەسێکە کاتێک پێویستی هەبوو دووربکەوێتەوە کاتێکیش پێویستیان پێی بوو نزیک بکەوێتەوە.

- هاوڕێی خۆت یان هاوڕێی باوکت خۆش بوێت.

- کاتێک یەکێکتان لە بیاباندا بینی پرسیاری ڕێنیشاندانی لێ مەکەن، چونکە بەتەنها بوونی کەسێک لە بیاباندا گومانی ئەوەی لێدەکرێت ڕێگر و دز بێت یان شەیتانێک بێت ڕێگەتان لێ هەڵە بکات ووریای دوو کەسیش بن مەگەر شتێک ببینن و من نەیبینم، چونکە کەسی ژیر کاتێک بەچاوی خۆی شتێکی بینی هەق لەوەوە داناسرێتەوە، ئەوەی کەسی ئامادەش دەبینێ کەسی نا ئامادە نایبینێ.

- خودایە هاوەڵانم بێ ئاگا نەبن لەوەی ئەگەر یادی تۆم کرد یارمەتیم نەدەن و ئەگەر تۆشم لەیاد کرد ئادم نەخەنەوە و کاتێک فەرمانم کرد بە گوێم نەکەن و کاتێکیش بێدەنگ بووم خەفەتبارم بکەن.

- کورِم؛ گوێ لە وتە و ئامۆژگارییەکانم بگرە و ئەوەی پێتیدەڵێم وەربیگـــرە بـــۆ ئەوەی تەمەنـــدرێژ بیــت. مـــن وانەی خواناســـی و مەعریفەتم فێر کردیت و بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیم کردیت. کاتێک لە ژیاندا ڕاستکردار بیت و، بیر لە ئافراندان و ئایاتی خوا تێڕابمێنیت؛ دڵنیابە خواوەند هێزێک دەنێرێت و ڕێنوێنیت دەکات و هیچ لەمپەرێک لەســەر ڕێـگەکەت بـوونی نابێـت، هیچکـات لە ژیـان و لە هەڵـدێری خراپییەکان ناخلیسکێیت. ئەوەی فێربوویت لەبەری بکە و بیپارێزە و لە دەستی مەدە، چونکە ژیـان و بەردەوامبوونی تۆیە. کورِم؛ مەچۆ سەر ڕێگەی بەدکاران و شوێنکەوتەی گوناهکاران مەبە و خۆیان لێ بە دوور بگرە. لەگوناهکار و بێ بڕواکان پەنا بۆ عالەمی غەیب ببە و لێیان دووربە. چونکە گوناهکاران تا خراپە نەکەن ناخەون و، تا نەبنە هـۆی گـومڕاکردنی خەڵـکان ئـۆقرە نـاگرن. خـۆراکی ئەوان سـتەم و خراپەکـارییە، بەڵام ڕێـگەی ڕاسـتکرداران وەک سـپێدەی بەرەبەیـان ڕوونە و وردەوردە ڕوون و ڕوونتــر دەبێــت تــا ســـەرئەنجام بــۆ ڕۆشنایی تەواوی ڕۆژ دەگۆڕێت، بەڵام ڕێگەی گوناهکاران وەک شەو تـاریکە. خراپەکـاران هەڵدەخلیسـکێن و لەنـاو دەچـن، بەڵام لەو شـتە ڕانامێنن کە بووەتە هۆی لەناوچوونیان.

- کوری شیرینم؛ ژیان هێندە کورتە و هێندە زوو تێپەڕ دەبێت کە تەنانەت بواری ئەوەت نییە ئەزموونەکانت دووبارە بکەیتەوە، کەواتە بۆ سەرکەوتن لە ژیانت هەوڵ بدە لە ئەزموون و شکستەکانی خەڵک کەڵک وەربگریت.

- بەڕاستی دنیا پردێکەو بەسەریدا بپەڕینەوە و ئاوەدانی مەکەنەوە.

- کوڕی شیرینم؛ بۆ ساتێکیش وته و ئامۆژگارییەکانم لەبیر مەکە. بە دڵ و هزری خۆتی بسپێرە و، بەکاری بهێنە. چونکە وتەکانم ژیان و سەربڵندی و شانازی و تەندروستیت پێدەبەخشێت. وریای بیرکردنەوەکانت بە، چونکە ژیانی مرۆڤ لە بیرکردنەوەکانیەوە دەست پێدەکات و شێوە دەگرێت. درۆ و ناڕاستی لە دەم و زمانت دووربخەرەوە. ئاگاداری ئەو کارانە بە ئەنجامی دەدەیت و، ئەو ڕێگەی هەڵیدەبژێریت و، بیر لە مەبەستی داهاتوو و کاری داهاتوو بکەرەوە. کوڕەکەم؛ بەردەوام لەسەر ڕێی ڕاست بە بۆ ئەوەی پارێزراو بیت، چونکە خواوەند یار و یاوەری ڕاست کردارانە، لە ڕێگەی ڕاست گومڕا مەبە و لە خراپەکان خۆت بەدوور بگرە.

- نارەحەتی و ناخۆشی زۆرم بینیوە و هەمیشە لەسەری ئارامم گرتووە.

- کوڕی خۆم، لەگەڵ هاوسەرەکەت بژی و خۆشحاڵ بە و، لە هاوسەرەکەت چێژ وەربگرە کە لە هەرەتی گەنجی هاوسەرگیریت لەگەڵ کردووە. دڵبەری و ئامێزی ئەو بۆ تۆ بەسە و، دڵی تۆ سەرەتا لە خۆشەویستی خوا و، دواتر هاوسەرەکەت لێوانلێو بێت. کوڕم؛ خواوەند چاودێریت دەکات و کارەکانت دەبینێت.

- کوڕەکەم وریابە؛ کەسانی خراپەکار و بێبڕوا ڕقیان لە کەسانی چاکەکار و بڕوادارە و، بەردەوام پیلانیان بۆ دەکێشن، بەڵام دڵنیابە خواوەند پارێزگاری لە تۆ دەکات.

- کوڕی ئازیزم، گوێ لە وتە و ئامۆژگاری حەکیمانەم بگرە و، سەرنجی وشیاری و زانابیم بدە.

- لە هەموو کارەکاندا بیر لە خوا بکەرەوە و زیکر و پەرستنی خواوەند و ڕاستکرداری بگرەبەر. ئەوسا دەبینیت هێزێکی شاراوە هاوڕێیەتیت دەکات. پێت دەڵێت چۆن هەڵسوکەوت بکەیت، ئەوسا کار و کردەوەکانت دەیسەلمێنن کەسێکی زانا و پێگەیشتوو و وشیاریت.

- کورم؛ ژنانی سۆزانی زمانچەورن و قسەکانیان هاوشێوەی بۆق لکێنەر و فریودەر و فرێنەرن. وریابە لە ژنانی سۆزانی و زیناکار خۆت بەدوور بگریت. ژنانی خراپەکار و زیناکار بەرەو مەرگ و جەهەننەم و بەدبەختی پەلکێشت دەکەن و، سەرئەنجام جگە لە تاڵی و ئازار هیچت بۆ نامێنێتەوە.

- ژنانی خراپەکار، بەردەوام لە هەوڵی گومڕاکردنی تۆدان و، بەرەو لای خۆیان بانگهێشتت دەکەن، چونکە ئەوان لە ڕێگەی ژیان گومڕابوون و سەرگەردانن و نازانن بەرەو کوێ دەڕۆن. کوڕی خۆم؛ لەم ژنانە خۆت بەدوور بگرە و، تەنانەت لە دەرگای ماڵەکەیان نزیک مەبەرەوە. نەکا لە داوە هەڵخەڵەتێنەرەکانیان گرفتار بیت و ئابڕووت لە دەست بدەیت و، پاشماوەی تەمەنت بۆ کەسێک تەرخان بکەیت کە نە بەزەیی هەیە و نە سۆز. نەکا ئەم ژنە خراپەکارانە ماڵ و گیانی ئێوە داگیر بکەن و، بەرهەمی هەوڵەکانی ئێوە لەم دنیا و لەو دنیا لەناو ببەن و، سەرئەنجام نەخۆش و گرفتاری ڕیسوایی و پەستیت بکەن. کوڕەکەم؛ بۆ هاوسەرەکەت ئەمەکداربە و، خۆشەویستی و عەشقی خۆت بە تەنیا پێشکەشی ئەو بکە.

- کوڕەکەم، گوناهی کەسانی خراپەکار هاوشێوی بەن لە دەوری خۆی گلۆلە دەبێت و گرفتاری دەکات. ڕابواردن و زێدەخوازی کەسی گوناهکار دەبێتە هۆی مردنی و، نەزانی بەرەو لەناوچوونی دەبات.

- کوڕی شیرینم، گوێ لە ئامۆژگاری و ئەزموونەکانم بگرە، هاوکاریت دەکەن کە ڕێگەی خواناسی و ژیانێکی شەرافەمەندانە و لێوانلێو لە ئەدەب و زانست فێرببیت، بۆ ئەوەی بتوانیت ژیانێکی باڵا و سەربڵندانە بژی. ئەوان فێرت دەکەن چۆن هەڵسوکەوتێکی خواپەسەندانە بگریتەبەر، تا ئاستی درککردن و زانایی تۆ زیاد ببێت و، بە بیستن و درککردنی ئەم پەند و ئامۆژگارییانە لە زاناکانیش زانەرتر بیت. کوڕم، ئەگەر بوویتە دەستەبەری کەسێک و بەڵێنتداوە کە ئەو قەرزەکەی دەداتەوە، لە ڕاستیدا بەم بەڵێنە خۆتت گرفتارکردووە. لە ڕاستیدا تۆ ئەسیری ئەویت و، دەبێت بە زووترین کات خۆت لەم گرفتارییە ڕزگار بکەیت. ئەم بەڵێنە نابەجێیە خەو و حەوانەوەت لێ دەستێنێت و ئارامی تۆ لەناو دەبات. تۆ هاوشێوەی ئاسکێک خۆت گرفتاری تەڵەی ڕاوچی، یان هاوشێوەی باڵندەیەک لە ناو قەفەسدا گرفتار بوویت. وریابە تەنیا دەستەبەری کەسانی لەخواترس و ڕاستکردار بکەیت، هەڵبەت بە لێکۆڵینەوە و ناسینی تەواو.

- کوڕی خۆم؛ تەمەڵی و بێکاری مرۆڤە بڕوادارەکان دەڕەنجێنێت، ئەوان بەردەوام حەز دەکەن خزمەتی خەڵکان بکەن و سەرقاڵی ستایش و خواپەرستی بن. ئارەزووی چاکەکاران هەمیشە بەراورد دەبێت، بەڵام بەو مەرجەی خۆڕاگر بن و، پشت بە خوا ببەستن و، لەزیکری خوا بێ ئاگا نەبن. هەروەها تووڕەیی و عەزابی خوایی بە کەسانی خراپەکار و ستەمکار دەبڕێت.

- کوڕی خۆشەویستم؛ زۆربلەیی و قەشمەری و گاڵتەکردن بە خەڵک مرۆڤ بەرەو گوناه پەلکێش دەکات، کەواتە وریابە، سەرەتا تێڕابمێنە و دواتر قسە بکە بۆ ئەوەی ئاستی زانین و پێگەت بەرز ببێتەوە و، ڕۆحت ئاسوودە بێت. کوڕم؛ هەوڵ بدە بێدەنگی تۆ هاوڕێ بێت لەگەڵ زیکری خواوەند، و تێڕامان و ناسینی ئافرێنراوەکانی.

- کوڕی خۆشەویستم؛ لە ژیانی مێروولەکان بڕوانە و وانە فێرببە، ئەوان ئاغا و لێپرسراو و سەرۆکیان نییە، بەڵام سەرەڕای ئەوە بە درێژایی هاوین هەوڵ دەدەن و خواردنی زستان کۆدەکەنەوە، بەڵام کوڕەکەم تۆ هاوڕێیەتی کەسانی تەمەڵ و تەوەزەل مەکە. ئەوان تەنیا دەزانن بخەون و کاتێک پێیان دەڵێیت هەستە و ڕۆزی و بژێوی ژیانت دابین بکە، دەڵێت با کەمێکی دیکەیش بخەوم و بحەوێمەوە. کوڕەکەم بزانە مرۆڤی تەمەڵ و تەوەزەل جگە لە هەژاری و دەستکورتی هەرگیز نابێتە خاوەنی هیچ شتێک. مرۆڤی تەمەڵ بەردەوام سەرقاڵی درۆکردنە و بۆ فریودانی خەڵک بیر لە پیلان و نەخشەی فریودەرانە دەکاتەوە. کوڕی خۆم، دڵنیابە خواوەند چەند شتێک پەسەند ناکات: زمانی درۆزن، نیگای کەسانی لەخۆڕازی، ئەو دەستانەی خوێنی بێ گوناه دەڕێژێت، ئەو هزرانەی بیر لە نەخشەی خراپ دەکاتەوە، ئەو قاچانەی بۆ خراپەکاری بە خێرایی هەنگاو هەڵدەگرن، شایەتی درۆزن، ئەو کەسەی دووبەرەکی لە نێوان هاوڕێکاندا دروست دەکات و سەرقاڵی گاڵتەجاڕییە بە مەبەستی پێکەنین و گاڵتە و قەشمەری کردن بەخەڵکان، بە گاڵتەکردن بە خەڵکان بۆ ئەوەی هاوڕێکانی بخاتە پێکەنین، چونکە هەم خۆی شوێنکەوتەی شەیتانە و هەم هزری شەیتانی بۆ خەڵکان دەگوازێتەوە. کوڕم، هەوڵ بدە لەگەڵ ئەم کەسانە پەیوەندی نەبەستیت، چونکە دەبنە هۆی بەدبەختی و بەفیڕۆچوونی ژیانت.

- کورِم؛ سامانی کەسێکی بێبڕوا کە سامانەکەی بۆ ڕەزامەندی نەفسی خەرج دەکات، هاوشێوەی پاوانەی زێڕە لە قاچی بەرازدا.

- کوڕەکەم؛ سامانی ڕاستەقینە بەو کەسانە دەبڕێت کە خواپەرستی دەکەنە پیشە و، ڕێگەی ڕاست و چاکەکاری دەگرنەبەر و، ئەو کەسانەی گوێڕایەڵی فەرموودەکانی ناو کتێبە ئاسمانییەکانی خواوەند دەبن؛ ئەوان بەختەوەری هەردوو جیهانن.

- کوڕەکەم؛ زۆر بە وردی سەرنج بە وتەکانم بدە، چونکە لەسەر فەرمان و بەزەیی خواوەند حەقیقەت و ڕاستییەکان دەڵێم و، ئەو فێرکارییەی بە تۆ و هاوڕێکانتی دەدەم لە زێڕ و خشڵەکان گرانبایتره. ناتوانین هیچ شتێک بە حەقیقەتی خواناسی و تێڕامان لە ئایاتی خواوەند بەراورد بکەین. ئەگەر کەسێک لەخواترس بێت لە خراپە و ناڕاستی بێزار دەبێت و، لە غرور و لە خۆرازیبوون و کردار و وتاری ناڕاست خۆی بەدوور دەگرێت. کورِم؛ ئەو کەسانەی خواوەندیان خۆشبوێت و، ئەوانەی بە دوای خواوەنددا بگەڕێن، دڵنیابە لە ڕێگەی تێڕامان و ناسینی ئایاتی خواوەنددا هەست بە بوونی خواوەند دەکەن، هەر کەسیش هەستی بە بوونی خواوەند کرد ژیان و سامان و زێڕ و تەواوی گۆی زەوی و شتەکانی ناو زەوی لای بێبایەخ و کەم بەها دەبێت.

- کـورم؛ کەسـانی سـتەمکار و زۆردار بەردەوام نـابن، تەنهـا ماوەیەک دەژیـن ئەویـش بە ریسـوایی، بەلام دوای مـاوەیەک لەبەرچـاوان نـامێنن و، تەنـانەت کەسـیش ناویـان نابـات. کەواتە هەوڵ بدە خواپەرسـت و چاکەکـاری بیت بـۆ ئەوەی نـاوت بـۆ هەمیشـە بە چاکە بمێنێتەوە. هەوڵ بـدە لەخـۆ بـوردوو و بەخشـەر بیت، تـا ژیـانی خۆت و بنەماڵەکەت بە ئارامی و ئاشتی بەردەوام بێت.

- کوری خۆم؛ منداڵی ژێر دبێته خـۆی خۆشـحاڵی بـاوک و، رۆحـی باوکی و رۆحی خۆیشی ئاسـوودە و، دایکیشـی شـادومان و سـەربلند دەکات.

- کورەکەم؛ دڵنیـابە خواوەند پارێزگـاری لە کەسـانی راسـتکردار و خۆپارێز دەکات و، فریشتەی رەحمەت بۆ پاسەوانیکرنی دەنێرێت.

کـورم؛ مرۆڤـی تەمەڵ و بێبـڕوا هەژارن و ئیرادەیـان لاواز دەبێـت، بەلام کەسـانی بـڕوادار ئارەزوو دەکەن هەم هاوکـاری خۆیـان بـکەن هەم کەسانی تر.

- کـورەکەم؛ وریـابە و ئەو سـامان و مـاڵ و داهـاتەی بەدەسـتی دەهێنیـت حەلاڵ و بە پێـی رەزامەنـدی خـوا و، لە رێـگەی راسـتەوە بەدەستی بهێنیت، چـونکە سـامانێک لە رێگەی حەرامەوە کۆکرابێتەوە هـیچ سـوودێکی بـۆ مـرۆڤ نابێت و، تەنـانەت رۆحـی مـرۆڤ پـیس و گـلاو دەکـات و، ئەو مـرۆڤەی بە رێـگەی حەرام سـامان و مـاڵ کۆدەکـاتەوە هاوشـێوەی نـۆکەرێکە و بەس. هەڵـبەت نـۆکەری ئەو منداڵانەی سامان و داهاتەکەی بۆ ئەنجامدانی گوناهەکان بەکاردەبەن؛ هاوار لەوان.

- کوڕی خۆشەویستم؛ کەسی ژیر و بڕوادار گوێ لە ئامۆژگاری و پەندەکانت دەگرێت، بەڵام کەسی نەزان و بێبڕوا لەخۆڕازی و نەزانە و، تەنیا خۆی لەناو دەبات.

- ئەو کەسانەی لەم دنیایەدا سەرقاڵی زیکر و خواپەرستین، باشترین بەرهەم دەچێنن و، دوای مەرگ باشترین بەرهەمەکان دەدوورنەوە، بەڵام ئەو کەسانەی خراپەکار و کوفر و یاخیبوون دەکەنە پیشە، هەم لەم دنیا و هەم لەو دنیا هیچ بەرهەمێکیان بۆ هەڵگرتنەوە نابێت.

- کوڕی خۆم؛ کینە و نەفرەت دەبێتە هۆی ئاژاوە و شەڕ، بەڵام موحیبەت؛ هاوڕێیەتی بە دوادا دێت و، دەبێتە هۆی ئاشتی و ئارامی و یەکگرتوویی.

- کوڕم؛ لەو کاتەوەی چاوم بە دنیا هەڵهێناوە و لە هەرەتی لاوی تا ئەمڕۆ کە پیر بووم، نەمبینیوە خواوەند کەسانی چاکەکاری بەجێهێشتبێت و، منداڵەکانی برسی و نیازمەند بووبێتن. مرۆڤی چاکەکار بە ڕاستکرداری و پاراستنی خواوەند، بەرەکەت بە ژیانی خۆی و بنەماڵەکەی دەبەخشێت، هەڵبەت دەبێت ماڵ و منداڵەکانیشی ڕاستکردار و سەرقاڵی پەرستنی خواوەند بن؛ تا ژیانیان بەردەوام و بەبەرەکەت بێت و، هاوشێوەی منداڵەکەی نوح دەرگای جەهەنەمییان بە ڕوودا نەکرێتەوە.

- کوڕە شیرینەکەم؛ ئەگەر کەسێکی خراپەکار کە بەردەوام گاڵتە بە کەسانی دیکە دەکات، سزای بدەیت و ئامۆژگاری بکەیت؛ جگە لەوەی ئیهانەت دەکات هیچی دیکەت دەستناکەوێت. وازی لێ بهێنە، چونکە گەر بتەوێت لە ڕێگەی ئامۆژگاری و پەندەوە هاوکاری بکەیت، لە تۆ بێزار دەبێت. بەڵام ئەگەر ئامۆژگاری مرۆڤی زانا بکەیت، تۆی خۆشدەوێت و، بە ئامۆژگاری و پەندەکانت خۆشحاڵ دەبێت. ئەگەر ئامۆژگاری کەسێکی زانا بکەیت، زاناتر دەبێت و، ئەگەر کەسێکی ڕاستکردار فێر بکەیت؛ کردەوەکانی باشتر و زیاتر دەبێت، چونکە لەخواترسان کۆڵەکە و بناغەی ژیری و وشیارییە و، بیرکردنەوە و تێڕامان لە ناسینی خواوەندی پیرۆز، مرۆڤ وشیار و زانا دەکات و، خواناسین و هاوکاریکردنی خواناسان، بەرەکەت و بەردەوامی بە تەمەن دەدات. بەڵام ئەگەر کافر ببیت بە خواوەند و عالەمی غەیب؛ زیانت بە خۆت گەیاندووە.

- کوڕم؛ لەگەڵ کەسانی خراپەکار و بێبڕوا هاموشۆ و هەڵسوکەوت مەکە، چونکە ئەوان شەو و ڕۆژ شمشێرەکانی خۆیان ئامادەکردووە تا هەژاران و نەداران تالان بکەن و بیانکەنە ئاماجی تیرەکانیان و، هەوڵ دەدەن چاکەکاران لە ناو ببەن، بەڵام نازانن شمشێرەکانیان لە دڵی خۆیان دەچەقێت و خۆیان لەناو دەبات.

- کوڕەکەم؛ بەهۆی خراپەکارانەوە خۆت مەڕەنجێنە و ڕژدی و ئێرەیی بەکەسانی دەوڵەمەند مەبە، چونکە ئەوانە وەک ئالیکی هەرزەیی کاتین و، بە زووترین کات سیس دەبن و دەژاکێن. پشت بەخوا ببەستە و چاکەکاری بکەرە پیشە بۆ ئەوەی لەم جیهانەدا بە پارێزراوی بژین و لەو دنیا لە بارەگای پەروەردگار ئاسوودەبیت. بە زیکری خواوەند و پەرستنی خواوەند لە ژیان بەردەوام بە و چێژی لێوەربگرە، چونکە خواوەند بە سەبر و خۆڕاگری ئارەزووەکانی تۆ بەدیدەهێنێت.

خۆت بە خواوەند بسپێرە و پشت بەو ببەستە و، دڵنیابە خواوەند لە هەموو کاروبارەکاندا پارێزگاری و هاوکاریت دەکات. خواوەند لە هەموو کارەکان پشتیوانت دەبێت. خواوەند ڕاستی و ڕاستکرداری تۆ بۆ هەمووان دەسەلمێنێت. بەردەوام و بە درێژایی ڕۆژ و بە بێدەنگی زیکری خواوەند بکە، جگە لەو کاتانەی دەتەوێت کەسێ بۆ ڕێگەی ڕاست و ڕاستکرداری ڕێنوێنی بکەیت. ئەو کاتانە باسی خواوەند و ئافرێنراوەکانی بکە و، خەڵکان بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی بکە. لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانەی بە فێڵ و تەڵەکە و سیاسەتی فریودان و گاڵتەکردن بە خەڵکان و، بە زۆر و ستەم بوونەتە خاوەنی پارە و سامان؛ خۆت بەدوور بگرە و ڕاوێژیان لەگەڵ مەکە. هەوڵ بدە ڕق و تووڕەیی لە خۆت دوور بخەیتەوە و، ئەندێشە و ڕۆحی خۆت بە بیرکردنەوە لە سامان و پێگەی دنیایی نەڕەنجێنیت، چونکە گوناهبار دەبیت. چاوەڕێی بەزەیی .و بەرەکەتی خواوەند بکە تا ڕۆح ئاسوودە و ئۆقرە بگرێت و، لە بەرەکەت و نیعمەتەکانی خواوەند سوودمەندبیت. کوڕەکەم؛ ڕاستکرداران و ڕاستگۆکان و بڕواداران لە ژیان بەهێز و بە بڕشت و لەبەمرابەر سەختی و دژوارییەکاندا خۆڕاگرن. بەڵام مرۆڤە لاڕێ و بێبڕواکان بەردەوام لە بەرامبەر دژوارییەکاندا لاواز و ناتوانا و بێ ئیرادەن. کوڕم؛ شاردنەوەی حەقیقەت و شایەتی درۆ، نا ئارامی ڕۆح و جەستەی لێدەکەوێتەوە.

بەلام وتنــی حەقــیقەت و خــۆڕاگری لە بەرامــبەر ســتەمکار و وەرگـرتنەوەی حەقــی ســتەملێکراوەکان؛ دەبێــتە هــۆی ئــارامی و ئاسوودەیی. دەم و زمانی بڕوادار و لەخواترسان سەرچاوی ژیانە، بەلام زمانی کەسانی خراپەکار و گاڵتەچی و قەشمەر، لێوانلێوە لە نەفرەت و ئاگری ڕق و دووبەرەکی نێوان خەڵکان.

- کوڕی خۆم؛ سامانی کەمی کەسانی چاکەکار و هەژار بابەخدارتر و بەهادارترە لە سامانی زۆری کەسانی ستەمکار، چونکە خواوەند هێزی خراپەکاران دەگرێت بەلام پارێزگاری لە چاکەکاران دەکات. خواوەند لە ژیانی کەسانی ڕاستگۆ و ڕاستکردار پارێزگاری دەکات و، میراتێکی شیاویان پێدەبەخشێت. مرۆڤی چاکەکار و ڕاستکردار لە سەردەمی بەلا و قاتوقڕیدا تێر و بێ کێشە دەبن، چونکە ڕۆحیان لە زیکر و ڕۆح و نووری خواوەندی تێرە، بەلام خراپەکاران لەناو دەچن و وەچەیان نامێنێتەوە.

- کوڕی شیرینم؛ کەسانی دانا و ژیر و خواناس و لەخواترس، وتە و کردەوەکانیان دەبێتە هۆی ئەوەی لای مرۆڤ و فریشتەکان خۆشەویست بن، بەلام وتە و کردەوەی کەسانی نەزان و گومڕا دەبێتە هۆی گومڕایی و نەزانی و پەستی ئەوان.

- کورِم؛ دوژمنانی خوا وەک مێشوولە لە تاریکدا دێنەدەر و لە تاریکیشدا لەناو دەچن، ڕووناکی نابینن و هاوشێوەی دووکەڵ ون دەبن. خواوەند ڕێنوێنی خەڵک دەکات بۆ ئەو ڕێگەیەی پێویستە و، بۆ ڕێنوێنی ئەوان پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرێت، بەڵام ئەو کەسانەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواوەند دەکەن، پارێزگارییان لێدەکرێت و ڕێنوێنییان دەکات و، لە هەموو کاروبارەکاندا ڕێنیشاندەریان دەبێت. ئەگەر لە ژیاندا لە خراپە دووری بکەیت و چاکەکاری بکەیتە پیشە؛ ئەوا لە ژیاندا بەختەوەر و خۆشحاڵ دەبیت.

- لە زمان و دەمی کەسی دانا و خواناس، وتەی هەڵسەنگێنراو و ئارامبەخش دەبیستیت کە دەبێتە هۆی ئارامی خۆی و کەسانی دیکە، بەڵام کەسی نەزان و بێبڕوا و خوانەناس بە قسە بێهۆ و زۆربڵەییەکانی شەڕ و ئاژاوە لە نێوان کەسەکاندا دەنێتەوە و، ئارامی و هێمنی لە کەسانی دیکە دەستێنێت و، کێشمەکێش دێنێتە ئاراوە و، خۆی و کەسانی دیکە ڕەوانەی جەهەننەم دەکات.

- بڕوا و ئیمانی کەسی هەژار و چاکەکارییەکانی ئەو، لە دنیای کۆتاییدا دەوڵەمەندی دەکات و، دەیکاتە خاوەنی باخەکان و تەلارە ڕازاوە و بەهادارەکان.

- داهاتی کەسی چاکەکار و خواناس؛ ئارامی و شکۆ بە ژیان و گەورەیی دەبەخشێت، بەڵام کەسی دەوڵەمەندی خوانەناس و بێبڕوا ژیانی خۆی بەفیڕۆ دەدات و، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ڕێگەی گوناه و گومڕایی و سزا و بێئابڕوویی و پەستی و تاریکی و، لە کۆتاییشدا بە جەهەننەم و سزای هەمیشەیی کۆتایی دێت.

- ئەو کەسەی سزادان و ئەزموونی تاڵی کەسانی دیکە دەبێتە وانەیەک بۆی، لە ڕێگەی ژیان و زیندووبووندا هەنگاو هەڵدەگرێت، بەڵام ئەو کەسەی غرووڕەکەی ڕێگەی چاکسازی پێنادات و لەخۆبایی و بەرزەفڕە، سەرئەنجامی گرفتاری گومڕایی و تاریکی دەبێت و، بەرەو جەهەننەم دەڕوات.

- ئەو کەسەی بێبڕوایە، بەڵام بە درۆ و ڕیا خۆی وەک کەسێکی بڕوادار نیشان دەدات و پڕوپاگەندە و قسەی بێهۆ بڵاودەکاتەوە و، لە نێوان بڕواداران دووبەرکی و ئاژاوە دەنێتەوە -خوا ڕەحمی پێ بکات- هاوار لەو بەڵایانەی لەو دنیا بەرۆکی دەگرێت، هاوار بۆ ئەو سزا مەترسیدارانەی لەو دنیا دەیانچێژێت.

- زۆربڵەیی و قسەی بێهۆی دنیایی و، قسەکردن سەبارەت بە سامان و چێژە دنیاییەکان مرۆڤ بەرەو گوناه ڕێنوێنی دەکات و، کەسی ژیر و دانا ئەو کەسەیە قسەکانی بۆ ڕەزامەندی خوا و ڕێنوێنی خەڵک بۆ چاکەکاری و زیکر و پەرستنی خواوەند بێت و، بتوانێت لە هەموو قۆناغەکانی ژیاندا کۆنترۆڵی زمانی بکات.

- وتە و ئامۆژگاری کەسانی باش و بڕوادار و ڕاستکردار هەم دەبێتە هۆی سەربڵندی خۆیان و هەم دەبێتە هۆی زیندووبوونەوە و ژیانەوەی کەسانی دیکە و بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی دەکران.

- قسەی چاکەکاران و ئەوانەی مرۆڤەکان بۆ چاکەکاری و پەرستنی خواوەند ڕێنوێنی دەکەن؛ هاوشێوەی زێڕ و زیو بەهادارە، بەڵام قسەی خراپەکاران و ستەمکاران بەرەو لەناوچوون پەلکێشیان دەکات. کەواتە کوڕی خۆشەویستم، وریا بە!

- بە زیکر و پەرستنی خواوەند و تێڕامان لە خواوەند، فکر و هزری مرۆڤ گەشە و نوورانی دەکات و دەوڵەمەندی و شکۆ و مەزنی بە مرۆڤ دەبەخشێت، بەڵام خەیاڵ و وەهم و نەزانی بێبڕواکان و نەزانان دەبێتە هۆی مەرگ و سەرشۆڕی خۆیان و هاوڕێ و شوێنکەوتەکانیان.

- کەسی ژیر و بڕوادار بە وتنی زیکری خوا و تێڕامانی زیاتر لە خوا چێژ وەردەگرێت و ئارام دەبێتەوە، بەڵام مرۆڤی بێبڕوا و کەسی نەزان لە کردەوەی خراپی خۆی چێژی دنیایی تێپەڕ دەبینێت و، ئارەزووی بەدەستهێنانی سامانێکی زۆر دەکات بۆ تێرکردنی هەوا و هەوەسەکەی، خواوەند خۆی بەزەیی بە هەموو قۆناغەکانی ژیانی ئەو کەسەدا بێتەوە.

- ئەوەی کە خراپەکاران لە کردەوە ناڕاست و هەڵەکانی خۆیان دەترسن، بەسەریان دێت، بەڵام چاکەکاران و خواپەرستان بە ئارەزووەکانی دڵیان دەگەن.

- کردەوەی قێزەونی خراپەکاران و بێبڕواکان دەبێتە هۆی ئەوەی بەڵا و کارەسات وەک گێژەڵووکە بگاتە لایان و ئەوان لەگەڵ خۆی بەرەو جەهەننەم پەلکێش بکات، بەڵام کار و کردەوەی ڕاستکرداران و خواناسە حەقیقییەکان وەک چیایەک بەسەقامیگری دەمێنێتەوە و لە هەردوو دنیادا دەیانپارێزێت.

- کوڕی خۆشەویستم؛ هەرگیز داوا لە کەسانی خراپەکار و بێبڕوا مەکە ڕێنوێنیت بکەن. ئەوان جگە لە بەدبەختی و خراپەکاری هیچی تر نازانن، ئەوان هاوشێوەی دووکەڵن دەچنە چاوت و گرفتاری سزات دەکەن، بۆیە وریا بە!

- لە خواترسان و زیکر و پاڕانەوە و چاکەکاری ساڵەکانی تەمەن درێژ و بە بەرەکەت دەکات، بەڵام خراپەکاری دەبێتە هۆی گومڕایی و سەرشۆڕی و تەمەن کورتی و ژیان بەفیڕۆ دەدات.

- هیوا و ئاواتی چاکەکاران و ڕاستکرداران بە شادی و سەربڵندی کۆتایی دێت، بەڵام هیوا و ئارەزوویی خراپەکاران و بێبڕواکان سەرئەنجام بە جەهەننەم و ڕیسوایی کۆتایی دێت.

- خواوەند بۆ چاکەکاران و ئەوانەی زیکر و خواپەرستی دەکەن؛ قەلایەکی پارێزراو و دژێکی بەهێزە، بەلام خراپەکاران و بێبڕواکان هیچ ڕزگارکەرێکیان نییە و خواوەند لەناویان دەبات.

- ڕاستکرداران و بڕواداران بەردەوام لە ئارامی و خۆشیدان و، بە هۆی سۆزی خواوەند و نووری ئیمانەوە هەمیشە پارێزراون. بەلام کەسانی بێبڕوا و ناڕاست بەردەوام بە نیگەرانی و سزاوە ژیان بەسەر دەبەن و، سەرئەنجام لەناو دەچن و لەسەر زەوی نامێننەوە.

- کوڕم وریابە! لە هەموو کارەکاندا هاندانی شەیتانی دەبنە لەمپەر بۆ ئەوەی باشترین کار هەڵبژێریت. دەبێت هەر کارێک زۆر بە وردی و تێڕامان و گەڕان و لێکۆڵینەوە و پشتبەستن بەخوا ئەنجامی بدەیت. دڵنیابە بە کاری چاکە و ڕاستکرداری هەمیشە تەندروست و تەمەندرێژ دەبیت. لەبەر ئەوە بەردەوام دەبێت زیکری خواوەند بکەیت.

- ئەو کەسانەی خوازیارن بە باشی ژیان بەسەر ببەن دەبێت لە خواوەند و ڕاستکرداری و حەقیقەت نزیکببنەوە، چونکە دوای ناسینی خواوەند و دۆزینەوەی حەقیقەت خەم و پەژارە و کێشەکانیان چارەسەر دەبێت، ئەو کەسانەشی خراپەکاری دەکەنە پیشە، مردوون و لەناوچوون، ئەوان لە نەزانی و گومڕاییدا ماونەتەوە، چونکە نەزانین و گومڕایی سەرچاوەی هەموو بەدبەختی و سزاکانە.

- لەگەڵ کەسانی چاکەکار و لەخواترس بەردەوام لە ئارامیدایت و، چرۆی حیکمەت و خواناسی ئەوان ئارامی و هێمنی بە تۆ دەبەخشێت، بەڵام زمانی خراپەکاران و و بێباوەڕان بەردەوام لێوانلێوە لە قسەی سزادەری هاوشێوەی گەستنی مارێکی کوشندە و، بەئازارە.

- وریا بن حەقایەتی دنیا هاوشێوەی خواردنە بەتام و چێژەکانە، ئەو کاتانەی خواردنی بەتام و چێژتان بۆ دێنن و لەو خواردنە بەتامانە دەخۆن و زێدەڕۆیی دەکەن، دوای ئەوە نەخۆش دەکەون و ناچار دەبن بۆ چاکبوونەوە دەرمانی تاڵ بەکاربهێنن، کەواتە ئەگەر بە ئەندازەی پێویست بخۆن، هەمیشە تەندروست و لەشساغن، وریا بن شەیتان دنیا و گوناهەکان وەک شتێکی بەتام و چێژبەخش نیشان دەدات. وریا بن گرفتاری دنەدانی شەیتان نەبن بۆ ئەوەی تووشی گوناهی گەورە نەبن، چونکە گوناهکاران و شوێنکەوتەکانی شەیتان دوای لە مەرگ جەهەننەم دەبێتە جێگەیان و، لە ئاوی تاڵی جەهەننەم و میوەی زەقنەمووتی جەهەننەم دەخۆن، کە هاوشێوەی کردەوەکانی خۆیان تاڵە، کەواتە وریا بە کوڕەکەم!

- کوڕم باران، داوا لەخوا بکە فکر و ئەندێشە و دڵی تۆ نوورانی و ئاوەڵا بکات تا بتوانی ڕەزامەندی خراپەکاران بەدەست بێنیت. هەرکات فکر و ئەندێشە و دڵت نوورانی بوو، ئەو کاتەیە هەست بەحەقیقەت دەکەی و لەهەموو کارەکان دادپەروەری دەکەیتە پیشە.

- باشترین خۆشبەختی و گەورەترین پێگە، ئەو زانستەیە کە تۆ بە ئەنجامـــدانی کـــاری چـــاکە و چاکەکـــاری بـــۆ خێـــزانەکەت و، بەرەوپێشـبردنی ژیـانی ژێـر دەسـتەکان و مرۆڤەکـانی تـر بەکـاری ببەیـــت. هەرگیـــز بە ســـتەم ڕازی مەبە و بەردەوام هـــاوڕێی ستەملێکراوان بە، هاوکارییان بکە و ڕووبەڕووی ستەمکاران ببنەوە.

- کوڕەکەم؛ خۆت بەدوور بگرە لە هاوڕێیەتی ئەو کەسەی ناتوانێت نهێنییەکانی ژیـانی خـۆی بپارێزت، چـونکە ناتوانیـت نهێنییەکانـت لای کەسـێکی لەمشـێوەیە بـدرکێنیت، لەگەڵ ئەم هاوڕێیـانەدا بە جۆرێـک هەڵسـوکەوت بـکە کە هەرگیـز پێویسـتت بە قـازی و دادوەر نەبێـت و، کـــردەوە و مامەڵەکانـــت بە جۆرێـــک بێـــت، ئەگەر لە کارەکانتـــدا ڕووبەڕووی دادگا کرایتەوە، سەرکەوتنت پێببڕێت.

- کوڕی خۆم وریابە؛ لە هەموو کاروبارەکاندا هەرچەنـدە پاسـەوان و پـارێزەر زیـاتر بێـت، بەهێـزی و ئەمنیەتـی زیـاتر لە ئـارادا دەبێـت، بەڵام بـۆ پاراسـتنی نهێنـی و ڕازەکـان هەرچەنـدە ژمـارەی کەسـەکان زیـاتر بێـت، نهێنییەکـان ئاشـکراتر دەبـن، وریـابە، گـوتەیەک کە بـێ هەڵسـەنگاندن لە زارت بێتەدەر، بـێ بـایەخ و سـووکت دەکـات، ئەگەر وتەکانـت تێڕامـان و نییەتـی خێـری تیـا نەبێـت هـیچ بەهایەکـت لای خەڵکان بۆ ناهێڵێتەوە.

- کوڕم وریابە؛ ئەگەر مەبەستت بەختەوەری و خۆشبەختی خەڵک و کۆمەڵگا بێت، زۆر باشترە لەوەی تەنیا بیر لە بەختەوەری خۆت بکەیتەوە، هەوڵ بدە بەختەوەری پێشکەش بە خەڵکان بکەیت، بۆ ئەوەی خواوەند لەم دنیا و لەو دنیا بەختەوەریت پێببەخشێت، دڵنیابە هەر کەس بە دوای خێر و بەختەوەری خەڵکانەوە بێت، سەرئەنجام بەختەورەی خۆی بەدەست دەهێنێت.

- هاوڕێیەتی کەسانی مەغروور و لەخۆڕازی مەکە، گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کەسانە مەکە وتە لۆژیکیی و ژیرانەکانی تۆ بە درۆ دەخەنەوە، قسە بۆ ئەو کەسانە مەکە کە گرنگی بە وتەکانی تۆ نادەن، دڵنیابە زاناترینی خەڵکان کەسێکە بێدەنگ و بیر لە ئایەتەکانی پەروەردگار دەکاتەوە.

- کوڕم وریا بە! گشتگیرترین جۆری نادادپەروەری ئەوەیە کە دادپەروەرانە بەرچاو بکەویت و، خۆت بەدادپەروەر نیشان بدەیت، ئەمە لە کاتێکدایە کە دادپەروەر نیت، کوڕم دڵنیابە تەنیا دادپەروەری دەتوانێت سەرکەوتن و سەربڵندیت پێببەخشێت و، بزانە بەخشش و چاکە و دادپەروەرییە کە دەتوانن بەهۆیەوە دوژمن بکەیتە هاوڕێی خۆت.

- کوڕەکەم وریا بە! ئەو کەسانەی بە دوای عەیبی خەڵکانەوەن و بەردەوام عەیب لە کەسانی دیکە دەدۆزنەوە، هاوشێوەی مێشێکە کە بەردەوام لە شوێنی پیس دەنیشێتەوە و پیسییەکان کۆدەکاتەوە و، لە پاکژی و خاوێنی خۆی بەدوور دەگرێت، وریا بە! هەموو زێڕەکانی سەرزەوی بە ئەندازەی زەڕەیەک باشی و ڕاستی بەهای نییە.

- کوڕی خۆم وریابە!

زۆر لە مرۆڤەکان ڕوخساریان جوانە، بەڵام لە ناخەوە قێزەون و ناشیرینن، وریابە! فریوی ڕواڵەتیان نەخۆیت، بەهەمانشێوە زۆر کەسیش هەن ڕوخساریان ناشیرین و ناحەزە، بەڵام کردەوەکانیان بە ڕادەیەک جوانە ڕوخساری ناشیرینی ئەوان دادەپۆشێت و لای خەڵک جوان دەردەکەون. هەمیشە لە ئاوێنەی ڕوخسارت بڕوانە، ئەگەر ڕوخسارت جوانە، کارێکی شیاوی جوانییەکەت ئەنجام بدە بۆ ئەوەی ڕوخسارت قێزەون نەبێت، ئەگەر ڕوخسارت جوان نییە، هەوڵ بدە ناشیرینی ڕوخسارت بە قێزەونی کردەوەکانت ناشیرینتر نەکەیت.

- کوڕم؛ خواوەند بۆ گەیشتن بە ترۆپکی کەماڵ و پێگەیشتن؛ ڕەنج و کێشەی زۆری داناوە، بەڵام بزانە ئەگەر لە بەرامبەر کێشەکان خۆڕاگر بیت و، پشت بەخوا ببەستیت و سەختییەکان تێپەڕێنیت؛ ئەو کاتە پێگەی بەرز و شکۆدارت بەدەستهێناوە و، لەخوا نزیک بوویتەتەوە. گەیشتن بە بەرزترین ئاستی نزیکی بە تێپەڕبوونی کات بەدەست نایەت، بەڵکو بە زیکری خوا و ڕاستکرداری و پەرستنی خواوەند بەدەستدێت، دڵنیابە؛ نزیکیت لە خواوەندەوە سەرچاوەی ئارامی ڕۆحە.

- کوڕەکەم؛ گوناه و کارە قێزەونەکان بە بچووک مەزانە و ئاگادار بە کارە قێزەونەکان لەسەر یەک کەڵەکە نەبێت و تۆ لەناو ببات!

هەروەها خۆشەویستی و ڕاستیش لەبیر مەکە و بە کەمی مەزانە، تۆ لە خۆشەویستی زۆرەوە نزیک دەبیتەوە و دەگەیتە نزیکترین ئاست و سەربڵندی، تا ئەو جێگەیەی دەتوانیت خۆشەویستی ببەخشە و ڕاستی بڵێ بۆ ئەوەی نوورانی ببیت.

- لەگەڵ هەر کەس بوویتە هاوڕێ و لە کارە دنیایی و ڕۆژانەکان شــەریک بــوون، هەوڵ بــدە پــێش شــەراکەت تــاقی بکەیــتەوە و، لە کارەکــانی تێڕابمێنیــت و، بە کــار و کردەوەکــانی تــاقی بــکەرەوە و، هەوڵبــدە ئەو بەڵێنــانەی دەیــدات هاوشــێوەی کــاری ئەنجامــدراو بێــت، نەک ئەوەی بەڵــێن بــدات و قســە بکــات و دوای کاتژمێرێــک لەبیــر بکرێت. ئەو کەسەی بەڵێن دەدات و جێبەجێی ناکات وەک مێشـهەنگی بێ هەنگوینە.

- کوڕم؛ لە تەندروستی و جوانی و هێـز و سـامان و هەمـوو ئەو شـتە باشـانەی خواوەنـد پێـی بەخشـیویت، بۆ خێـر و هاوکـاریکردنی خەڵـک کەڵکیـان لێـوەربگرە و، هەوڵ بـدە تەنیـا لە ئەنجامـدانی کـاری چـاکە و خێـردا پەلە بکەیـت، بەڵام لەو کـارانەی لە دەرئەنجامەکـانی دڵنیانیت، سەبر و خۆڕاگری بکەرە پیشە بۆ ئەوەی ڕاستی یا ناڕاستی کارەکەت بۆ ڕوون ببێتەوە و دواتر ئەنجامی بدەیت.

- کوڕم؛ ئەگەر بە درێژایی ژیان بتەوێت پێگە و جێگەی هاوڕێکانـت و کەسـێک بناسـیت، بـۆ تـاقیکردنەوە و ناسـینی ئەو لە کارەکانـت ڕاوێژی پێ بکە تا هەست بە دادپەروەری و ڕاستی و ناڕاستی ئەو بکەیت و، بە تەواوی بیناسیت، هەڵبەت ڕاوێژکردنەکە تەنیا دەبێت بۆ ناســینی سروشــتی ئەو بێــت و، دوای ئەوەی بە جــوانی ناســیت، تێدەگەیت کە دەتوانیت ببیتە هـاوڕێی یا بەجێی بهێڵیت؟ بە خواستی خوا هاوڕێکانت بە وشیارییەوە هەڵدەبژێریت.

- کوڕی خۆم؛ هەرگیز هاوڕێیەتی کەسانی ناشوکر و ناسوپاس مەکە و، تەنیا لەگەڵ ئەو کەسانەدا پەیوەندی دۆستایەتی ببەستە کە لە هاوڕێیەتی و پاکیدا ڕازاوەن.

- کوڕی شیرینم فەرمان بکە بە چاکە و ڕێگری بکە لە خراپە و ئارامگربە لەسەر ئەو شتانەی تووشت دەبن.

- کوڕی شیرینم؛ ژیانم لە هەموو قۆناغەکاندا ئەزموون کردووە، بەلام لە کۆتاییدا تێگەیشتم ژیان بێ تێڕامان و بێ عەشق و پەرستنی خوا؛ بێ مانا و بێزارکەرە. کوڕم؛ تۆیش هەوڵ بدە بە بیرکردنەوە لە ئایاتی خواوەند و پەرستنی خواوەند، خۆت لە خوا نزیک بکەیتەوە، چونکە بێ خۆشویستنی خواوەند، دنیا و هەموو شتەکانی وەک گۆڕستانێکی بەربەرین و گەورەیە، کە ئەو گۆڕستانە کۆن و مێژینەیە و چەندین ساڵە کەس هاتوچۆی نەکردووە.

- کوڕەکەم؛ هەمیشە ڕووبەڕووی ناڕاستی و خراپەکاری ببەرەوە و، لە هەموو کارەکانت پشت بە دادپەروەری و ڕاستی ببەستە و، بزانە بیرکردنەوەی باش و تێڕامان و ئەندێشەکردن، بەسەر هێزی توانا جەستەییەکانی مرۆڤدا سەردەکەوێت. دڵنیابە زۆربەی کاتەکان شمشێر و دەستەلات لە لایەن ئەندێشە و ڕێگەچارەی ژیرانەوە لەناو چووە، هەوڵ بدە هەموو کارەکان بە بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە و ڕاوێژکردنەوە ئەنجام بدەیت؛ بۆ ئەوەی لە هەموویاندا سەرکەوتوو و سەرفەراز بیت.

- کوڕی شیرینم بەڵا بەکەم بزانە و لێپرسینەوەی خۆت بکە پێش ئەوەی لێپرسینەوەت لەگەڵ بکرێت.

- بزانە و ئاگادار بە! مرۆڤی چاکەکار دەبێت هەوڵ بدات و تێبکۆشێت بیرکردنەوە و تێڕامانی دەربارەی خواوەند بێت و، لە کار و کردەوەکانیدا پشت بە ڕێنوێنییەکانی خواوەند ببەستێت و، شوێنکەوتەی کتێبە ئاسمانییەکان بێت؛ بۆ گەیشتن بە دوایین وێستگە کە گەشەکردنی تەواوی ڕۆح و تەندروستی جەستەیە. کوڕم، لە دنیادا دوو هێز هەیە یەکیان ئیلاهی و ئەوی دی شەیتانی و، دڵنیابە هەمیشە هێزی ئیلاهی سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت، چونکە لە ڕێگەی ڕاستکرداری و زیکری خواوەندەوە بەدەستدێت.

- کوڕم وریابە! کار و بژێوی ژیان و هاوبەشی تۆ لەگەڵ کەسانی بڕوادار، شادومانیت پێدەبەخشێت و، هاوبەشی لەگەڵ بێبڕواکاندا لە کەسایەتی و پێگەی تۆ کەم دەکاتەوە و، لای خەڵک بە کەسێکی سووک و کەم بایەخ دەردەکەویت. وریابە! تەمەن و ژیان هەرچەندە درێژبێت، تەواو دەبێت و هاوشێوەی پێڵو لێکنانێکە، هەوڵ بدە بە جۆرێک ژیان بەسەربەریت هەم خواوەند و هەم خەڵکەکەی لێت ڕازی بن.

- کوڕی ئازیزم هەڵخلیسکان بناسە، چونکە ئەگەر هەڵخلیسکانت ناسی لە ژیانتدا کەمتەرخەمی ناکەیت.

- هەوڵ بدە ڕۆژەکەت بە نـاوی خواوەنـد دەست پێبکەیت و، ئەندێشە و گوتار و کردارت بە خوا بسپێریت، تا لەم ڕێگەیەوە سەربڵندی بەدەستبهێنێت و ڕۆحت بەردەوام شاد و نوورانی بێت و، جەستەت بەهێز و تەندروست بێت. دڵنیابە هەر مرۆڤێک لە ڕێگەی زانست و گوتار و کرداری دروستدا، ڕاستی و ڕاستکرداری بەدەستبهێنێت، ڕۆحی ئارامییەکی مەزنی پێ دەبڕێت و، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ درەوشانەوە و ڕاستی ڕۆحی زیاد دەکات.

- کوڕی شیرینم هەرکەسێک دەمەقاڵێ کەم بکات بێوەی ئەبێت، هەرکەسێکیش زیادەڕەوی تێدا بکات تاوانباردەبێت.

- کوڕی خۆم؛ لە ئەنجامدانی هەموو کارەکاندا خواوەندت لەبیر بێت، گرنگی بە پەیمان و بەڵێنەکانت بدە و، ئەرکە ئایینییەکانت بە باشترین شێوە ئەنجام بدە، هەوڵ بدە دەربارەی هەموو شتەکان بە تایبەت جیهانی دوای مەرگ لێکۆڵینەوە بکەیت، بۆ ئەوەی لە هەموویاندا زانایی بەدەستبهێنیت، هەوڵ بدە ڕق و تووڕەیی لە خۆت بەدوور بگریت و، خۆت لە شەڕ و قێزەونی پاک بکەیتەوە و، سەبارەت بە بەلا و شەڕی کەسانی تر لێبوردەبیت و، لەگەڵ خراپەکاران و ستەمکاراندا پەیوەندی هاوڕێیەتی و هاونشینی نەبەستیت و، هاوکاری هەژاران و نەداران بکەیت و، لە جیهانی دوای مەرگ ئاگاداریان بکەیتەوە و پێیان بڵێت کە دوای مەرگ ژیان دەست پێدەکاتەوە.

- کوڕی خۆم هەق و ڕاستی بڵێ ئەگەر زەرەری خۆشتی تیابوو، گوێ بە تووڕەبونی کەسیش مەدە.

- کـورم؛ دڵنیـابە بە ئەنجامـدانی کـاری چـاکە و خواپەسـەندانە، دیوارێک لە ڕووناکی کە باشترین پارێزەر و دیاری و بەخششە لە لایەن پەروەردگـارەوە بە تـۆ دەبەخشـرێت، دڵنیـابە، سـەرئەنجامی سـەرکەوتنی هەر کارێـک بە چاکەکـاری و ڕاستییە. هەوڵ بـدە بە چاکەکـاری و زیکـری خواوەنـد و بیرکـردنەوەی لە ئایاتی خواوەنـد پەیوەندی لەگەڵ سـەرچاوەی هەموو باشییەکان ببەستیت کە خودی خواوەندە.

- کوڕی ئازیزم؛ ئەندێشەی ڕاست و بیرکردنەوەی باشە ئەوەیە کە لەسـەر دووریانەکانـدا هاوکاریـت دەکـات، بـۆ ئەوەی هەسـت بەحەقـیقەت بکەیـت و گـومڕا نەبیـت، وریـابە! لە هەر کارێکـدا بیـر بکەیـتەوە و بە دوای حەقـیقەت و ڕاسـتیدا بگەڕێـت. تەنیـا بە بیرکردنەوە دەتوانیت پەیوەندی لەگەڵ خوا ببەستیت بێ ئەوەی خۆت هەستی پێبکەیـت. بە ئەندێشـەکردن و تێڕامـانە خواوەنـد لە هەمـوو کارەکانتدا ڕێگەت نیشان دەدات و سەرکەوتنت پێدەبەخشێت.

- کـوڕم، باشـترین ڕێـگە ڕێـگەی خواوەنـدە، ئەویـش یەک ڕێگـایە، ڕێگەی ڕاستی و چاکەکارییە و، دڵنیابە خواوەند جەوهەری ڕاستی و دروستییە، خواوەند جیهان و هەموو شتەکانی جیهانی ئافراندووە تـا مرۆڤەکـان لە دەسـتەڵات و هێـزی خواوەنـد تێـڕابمێنن و، بەڕاسـتی و دروسـتی و هەوڵـدان و دادپەوەری بە باشـترین شـێوە ژیـان بەسـەر بەرن و، نیازەکـانی جەسـتە بە ئەنجامـدانی کارەکـانی ڕۆژانە و، نیازەکـانی ڕۆح بە زیکـری خواوەنـد و بێـدەنگی و تێڕامـان لە ئافرێنراوەکـانی ئامـادە بـکەن، بـۆ ئەوەی بتـوانن هەم لەم دنیـا و هەم لەو دنیا دوای مەرگ، ژیانێکی بەختەوەرانە بژین.

- کوڕی خۆم؛ ئاوەزی تۆ تەنیا ئامرازی پەیوەندی تۆ لەگەڵ خواوەندە کە دیارییەکە لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ مرۆڤەکان و، لە کتێبە ئاسمانییەکاندا بە ڕۆح ناوی هاتووە. لە سوورەتی (الاسراو) (کۆتایی ئایەتی 60 تا 6 و سوورەتی (ص) کۆتایی ئایەتی 70 تا کۆتایی) سەبارەت بەم دیارییە فەرموودەکانی خواوەند دەبینیت. بە شوێنکەوتن و پەیڕەویکردن لەم دیارییە گەورەیە و، هاوکاری وەرگرتن لێی لە ئەنجامدانی کارەکان سەرکەوتوو و سەربڵند و سەرفەراز دەبیت، بەڵام گوێڕایەڵی شەیتان و ئەنجامی کارە نەشیاوەکان، ئەم دیارییە گەورەیە واتە ڕۆح یان ئاوەز لەناو دەبات و بە درێژایی ژیان گومڕا دەبیت. کوڕم وریابە! لە هەموو کارەکاندا پشت بە ئاوەز ببەستیت، ئەندێشە بکە بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئاوەزەوە باشترین و گونجاوترین ڕێگەچارە هەڵبژێریت و ئەنجامی بدەیت. کوڕەکەم؛ مرۆڤی ژیر کەسێکە لە هەموو کارەکاندا پشت بە ئاوەز دەبەستێت و، خۆی بەجۆرێک پەروەردە دەکات کە بتوانێت و لە کارەکان تێڕابمێنێت و، لە پەیوەندی نێوان خواوەند و مرۆڤ کەڵک وەربگرێت.

- کوڕی ئازیزم خواردنت کەم بکەرەوە و بە دانایی و حیکمەت خۆت پڕ چەک بکە.

- کوڕی شیرینم؛ خەم و خەفەتی دنیا و زیکرنەکردنی خواوەند پەیامهێنەری مەرگە، وریا بە! ئەو ساتانەی بە دنیاوە سەرقاڵ بوویت، بە ژیان و زیندووبوون بەراوردی مەکە، ئەو ساتە، کاتێکە سێبەری مەرگ و گومڕایی تۆی گرتۆتەوە و، دەبێت چاوەڕوانی سزا و کارەسات بیت.

- کورم وریابە! لە هەموو کارەکان و دادوەرییەکانتدا بەدرێژایی ژیان، دادوەرییەکانت لەسەر بنەمای وشیاری و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بۆ کارەکان ئەنجام بدەیت، نەک ئەوەی لەسەر بنەمای قسەی خەڵک و پەلەکردن و هەڵسەنگاندن لەسەر بنەمای ئەو شتانەی لە خەڵکت بیستووە، وریابە! خەڵک گوێ لە کەسێک دەگرن کە دانا و ڕاستکردار و لایەنگری ڕاستی و حەقیقەت بێت.

- کوڕی خۆم کۆڵی ئاسن و قورقوشمم زۆر کێشاوە و بارکردووە بەڵام لە قەرزاری قورسترم نەبینیوە.

- کورم؛ تێرامان و بیرکردنەوە -بیرکردنەوە ئامرازێکە خواوەند لەناو مرۆڤدا جێگیری کردووە-، مرۆڤ بە بیرکردنەوە دەتوانێت لە ناسین و دەستەلاتی خواوەند تێرابمێنێت و، تێرامان کە بیرکردنەوەی قووڵە، ڕێگەی ناسین و ئاگاداربوون لە ئافراندانەکانی خواوەند نیشانی مرۆڤ دەدات، هەر وەک بیرکردنەوەی پەیوەندییەکی کاتییە، بەڵام ئاوەز و عەقڵ پەیوەندییەکی ئەزموونی و ئەزموونی چەندین ساڵە دێنێتە ئاراوە، کەواتە وریا بە! هەمیشە و بە درێژایی تەمەنت بۆ ئەنجامدانی کارەکان پشت بە ئاوەز و عەقڵت ببەستیت، چونکە پەیوەندی نێوان تۆ و پەروەردگارە. ئەگەر بەردەوام پشت بە ئاوەز ببەستیت؛ ئەو کاتە کەسێکی ژیریت. هەوڵ بدە بۆ ناسینی خواوەند بەردەوام بیر بکەیتەوە و بە تێرامانەوە کە بیرکردنەوەی قووڵە، درک بە فەرموودەکانی پەروەردگار بکەیت. ئەگەر لە ئایەت و فەرموودەکانی خواوەند تێرابمێنیت، ئەو کاتە کەسێکی بیرمەندیت و، مرۆڤی ژیر و بیرمەند کەسێکە بەردەوام لە بێدەنگیدا بیر لە ئایاتی خواوەند دەکاتەوە و، لە زیکری خواوەند نوقم بووە و، بە تەواوی لە خواوەند نزیککەوتۆتەوە.

- ئەی کوڕی خۆم ئامادەی مردوو ناشتنبە، بەڵام ئامادەی شایی و ئاهەنگ مەبە، چونکە مردوو قیامەتت بیردەخاتەوە، بەڵام شایی خۆشی دنیات ئەخاتە دڵ.

- کورم لەبیرت بێت! کەسێک دەتوانێت لە نیعمەتەکانی پەروەردگار کەڵک وەربگرێت کە ڕێگەی ڕاست و ڕاستکرداری بکاتە پیشە و، بەردەوام خوا بپەرستێت و، خەڵک بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی بکات. مرۆڤ تەنیا بە زیکر و پەرستنی خواوەند بە ڕزگاری دەکات و، بۆ گەیشتن بە بەختەوەری و بەخشینەکانی خواوەند و نزیکبوونەوە لێی، دەبێت لە کاری چاکە بەردەوام بێت.

- کوڕی خۆم نان مەخۆ بەسەر تێریدا، ئەگەر ئەو نانە بدەی بە سەگ باشترە لەوەی خۆت بیخۆیت و برسیت نەبێت.

- کورم وریابە! چاو نەبڕیتە سامان و داهاتی کەسانی دیکە، بەوەی کە خواوەند پێی بەخشیویت ڕازی بە، ڕۆزی و سامانی تۆ وەک شیری دایکت پێت حەڵاڵە، بەڵام سامان و داهاتی کەسانی تر کە لە ڕێگەی جیاواز کۆکراوەتەوە حەرامە، وریابە بە پاشکەوتی خۆت ڕازی بیت بۆ ئەوەی سامان و داهاتەکەت لە دەست نەدەیت. باشترین پاداشت و گەورەیی ڕاستی و دروستییە لەکارەکاندا و، خراپترین و قێزەونترینی دۆخەکان ناشوکری خواوەندە. بەردەوام ڕۆحی ڕاستیبێژ شاد و خۆشحاڵە، بەڵام ڕۆح و ناخی ناسوپاس و ناشوکر گرفتار و پڕ ڕەنج و خەمە. ڕاستی و حەقیقەت ڕێگەی بەختەوەری و، درۆ و ناشوکری ڕێگەی خراپە و گومڕاییە.

- کوڕی خۆشەویستم؛ ئەو کەسەی لە خراپەکاری تۆبە بکات و، لە ڕێگەی شەیتان و گوێڕایەڵی شەیتان پاشگەز ببێتەوە و، پەیوەستی پەروەردگاری تاقانە بێت، خوداوەند ڕۆحی پاسەوان بۆ پارێزگاری ئەو دادەنێت. کوڕم؛ ئەو کەسانەی لە ڕێگەی خوا و کاروبارە ئاینییەکاندا دووچاری شک و شکست دەبنەوە حەقیقەتیان بەتەواوی نەناسیوە. ئەوانە لە ژیاندا زوو فریو دەخۆن و خراپترین ئەندێشە و بیرکردنەوە تەنگیان پێهەڵدەچنێت و، دەرئەنجام بەرەو هەڵچوون دەڕۆن و، ژیانی خۆیان و خەڵکانی دیکەیش بەفیڕۆ دەدەن.

- کوڕی خۆم ئەوەی سەرزەنشتی خۆی بکات براوەیە، ئەوەی سەرنجی ئەنجامی کارەکانی بدات سەرکەوتوە.

- کوڕی خۆم  ئەوەی شوێنکەوتەی ئارەزووەکانی بێت گومڕایە، ئەوەی لەخودا بترسێت بە بەزەیی دەبێت، ئەوەی تێگەیشتوو بێت زانایە، ئەوەی بینایی ڕۆشن بێت تێگەیشتووە.

- کوڕەکەم؛ تۆ دەبێت پێش ئەنجامدانی هەر کارێک پشت بە ئاوەز ببەستیت و، بیر لەئەنجامدانی کارەکان بکەیتەوە تا لە ڕێگەی بیرکردنەوە و پشتبەستن بە خواوەند؛ باشترین ڕێگەچارەی کێشەکان و سەرکەوتن لە کارەکانت بۆ دەستەبەر ببێت، ئەگەر دەخوازیت خواوەند لە هەموو کارەکاندا هاوکار و پشتیوانی تۆ بێت؛ سەرەتا دەبێت بۆ ڕزگاری بەردەوام بە زیکر و پەرستنی خواوەند سەرقاڵ بیت و، هەوڵ بدەیت ئامۆژگاری و ڕێنشاندەری کەسانی دیکە بیت.

- کوڕی ئازیزم؛ لە ئەندێشە و بیرکردنەوە لە دنیا و شتە ماددییەکان خۆت بەدوور بگرە کە دەبێتە هۆی خەم و خەفەت. لە گومڕایی و ڕەشبینی و لەخۆباییبوون خۆت بەدوور بگرە و، هەوڵ بدە لەهەموو قۆناغەکانی ژیاندا دەم بە پێکەنین و خۆشحاڵ بیت و، لەگەڵ خەڵکانی ژێردەستە بە نەرم و نیانی هەڵسوکەوت بکەیت، ئەوە بزانە لای خواوەند هیچ کەسێک گەورەتر و لەپێشتر نییە مەگەر کەسانی بڕوادار و ڕاستکردار!

- کوڕی خۆم وریابە! ئەو کەسانەی بە هۆی نەزانییەوە بیر لە فەرموودەکانی پەروەردگار ناکەنەوە و بەردەوام سەرقاڵی پاشەکەوتکردنی ماڵ و سامانی دنیان، تەماحەکەیان دەبێتە هۆی ئەوەی ڕێگەی خواوەند و ڕێگەی ڕاستی و حەقیقەت ون بکەن و، ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی گرفتاری سزایەکی هەمیشەیی بن لە جیهانی دوای مەرگدا. کوڕم وریابە!

- کوڕم؛ ئەگەر بەردەوام ڕاستکردار بیت و، سەرقاڵی زیکری خواوەند و ڕێنوێنی کردنی خەڵکان بیت، هەر کەس بیەوێت خیانەتت لێ بکات، چ درۆزن بێت، چ فێڵباز، هەر کۆسپ و تەگەرەیەک بۆ تۆ دروست بکات، یان بخوازێت خیانەت لە سامانەکەت بکات، دڵنیابە خواوەند خیانەتەکەی بۆ تۆ ئاشکرا دەکات و، ئەو کەسە ڕیسوا دەکات. تا دەتوانیت لەگەڵ خواوەند ڕاستگۆ بە و، خەڵکان بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی بکە.

- کورم؛ بڕوادار و خۆپارێز کەسێکە لە ژیان و لە خۆشییەکان و لە چێــژ و ئارامییەکـانی ژیانـدا خـۆڕاگر بێــت و، لە کـاتی ســەختی و دژوارییەکانـدا زەلیـل و ڕیسـوا نەبێت و، لە خۆشـی و چێژەکانیشـدا سـەر مەسـت و لەخۆبـایی نەبێت و، بە نـوێژ و زیکـر و پـاڕانەوەی خواوەنـد، ڕۆحـی خـۆی نـوورانی و چـاوی بە ڕووی ڕاسـتییەکاندا بکـاتەوە و، بە بیرکـردنەوە لەفەرموودەکـانی خواوەنـد دڵـی ڕوونـاک بکاتەوە.

- کــورم؛ ئەگەر ویســتت هاوســەرگیری بکەیــت، لەگەڵ ژنێکــی لەخــواترس و داوێنپــاک و بە حەیــادا هاوســەرگیری بــکە. ژنــی لەخواترس و داوێنپاک سـەرچاوەی خۆشـی و ئارامی و بەختەوەری ژیانە، ئەو کەسەی خۆشەویستی بە ژنی لەخواترس ببەخشێت، ڕێزی لە ژیـان و ئـارامی ژیـانی خـۆی گرتـووە. هەوڵ بـدە لە هەڵبژاردنـی هاوسەر گرنگی بە جوانی ڕوخسار و سـامانی بـاوکی نەدەیت، بەڵکو بیــر لە داوێنپــاکی ئەو بــکەرەوە. کاتێــک وەک هاوســەری خــۆت هەڵتبــژارد، بە جۆرێــک پەروەردەی بــکە ژنــان و کچـانی دیـکە بـۆ داوێنپـاکی هـان بـدات و، منـداڵەکانت بەرەو ڕزگـاری و ڕاسـتکرداری ڕێنـوێنی بکـات. هاوسـەرەکەت بە جۆرێک پەروەردە بکە بە ڕادەیەک لەخواترس و داوێنپاک و ڕێنیشـاندەری ژنـان بێت کە هەمـووان وەک کەسێکی ڕاستکردار بیناسـن و، بە دڵپاکییەوە وتەکـانی ئەنجـام بدەن. ڕەحمەتی خوا بۆ ژنان و پیاوانی ڕاستکردار و لەخواترس.

- ئەی کوڕی خۆم مەبە بە شیرینیەک کە خێرا قوت بدرێیت و مەبە بە تاڵیەک کە تف بکرێیتەوە.

- کوڕی خۆم هێنده دڵ به دنیا مەده بەجۆرێک قیامەتت بدۆڕێنی و شەرمەزاری لای خودا بیت، ئەوەندەش دەست لە دنیا بەرمەده که ببیت به مشەخۆر بەسەر خەڵکیەوه.

- کوڕی شیرینم؛ ئەگەر بتەوێت لە شەڕی شەیتان و شوێنکەوتەکانی و، هەروەها بەڵای مرۆڤە قێزەونەکان و خراپەکاران ڕزگارت بێت که زیاتر لە هەموو جنۆکەکان کاریگەری لەسەر مێشکت دادەنێن و، بۆ کاری خراپە هانت دەدەن، دەبێت ناوی خواوەند بەردەوام وێردی سەرزمانت بێت، چونکه ئەو دەتوانێت هەموو بەڵا و بەد بەختییەکانت نەهێڵێت.

- کوڕەکەم؛ نابێت تۆ لەگەڵ مرۆڤی بێبڕوا و درۆزن پەیوەندی ببەستیت و، هاوڕێیەتییان بکەیت، نابێت قسەی کەسانی بێبڕوا کاریگەری لەسەر تۆ دابنێت و ئیمانت لاواز بکات، چونکه کەسانی بێ ئیمان و خوانەناس گیان و ماڵ و ڕۆحی تۆ لاواز دەکەن و، به شێوەیەکی نەشیاو سامانی تۆ بەکاردەبەن. هەوڵ بده لەو کەسانه خۆت بەدوور بگریت و، هاوڕێیەتی کەسانی ڕاستگۆ و لەخواترس بکه.

- کوڕەکەم؛ دڵنیابە ئەو کەسەی ئەندێشە و بیرکردنەوەکانی بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خواوەند بێت و، تەنیا لەبەر ڕەزای خوا کار و کردەوەکانی ئەنجام بدات و، بەردەوام به بیرکردنەوە لە خواوەند کارەکانی ئەنجام دەدات؛ ئەوا ئەم کەسە لە هەموو کارەکانیدا پێشکەوتن بەدەستدەهێنێت و ڕۆح و ناخی لەگەڵ ڕاستی و حەقیقەت یەک دەگرێتەوە. ئەو کات ئەم کەسە به بەردەوامی لە ڕووی جەستەیی و ڕۆحییەوە لە ئارامیدایە.

- کوڕەکەم؛ دڵنیابە ئەو کەسەی بە ڕاستی و دروستی ژیان بەسەر دەبات زیانی پێناگات، چونکە خواوەند لە هەموو کارەکانیدا هاوکاری دەکات و، لە بەرامبەر هەموو خراپییەکان دەیپارێزێت. دڵنیابە هەرگیز زیان بەو کەسە ناگات کە هاوکاری هەزاران دەکات و، چاکەکاری و ڕاستکرداری بڵاو دەکاتەوە و، خەڵک بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی دەکات.

- کوڕی ئازیزم؛ دڵنیابە تەنیا ڕێگەی ڕزگاری و خۆپارێزی و نزیکبوونەوە لە خواوەند، لە ڕێگەی ڕاست و ڕێگەی خواوەندە، دڵنیابە هەر کارێکی دروست و، هەر تێڕمان و ئەندێشەیەکی پاک و، هەر دوعا و پاڕانەوەیەک لە دڵەوە سەرچاوە بگرێت؛ بێ وەڵام نامێنێتەوە. دڵنیابە ئەوەی لە ئەندێشە و بیرکردنەوەی تۆدا بێت، خواوەند لەوەدا بەهرەمەندت دەکات و تۆی لای فریشتەکان و لای مرۆڤەکان گەورە و ڕێزدار دەکات. هەڵبەت بە مەرجی بیرکردنەوەی چاک و بێگەرد.

- ئەی کوڕی خۆم ئەگەر گەدەت پڕ کرد بیرکردنەوەت و نامێنێت و دانایت کەڕ دەبێت و ئەندامانی جەستەت هەموو لەکار دەکەون.

- کوڕی خۆم؛ هەوڵ بدە گوێ لە ئامۆژگاری و پەند و ئەزموونی کەسانی دیکە بگریت و، بە ئەندێشە و تێڕامان هەڵیان بسەنگێنە و، هەر کامی خواپەسەندانە و عەقڵانی بوو بە کاری ببە و ئەنجامی بدە. تەنیا بیرمەندان و چاکەکاران باشترین ڕێگە هەڵدەبژێرن و، دڵنیابە خراپەکاران لەناودەچن. کورم، خۆڕاگری و سەبر کاتێک گونجاوە کە لە ناو کێشە و نەهامەتییەکاندا گرفتار بیت، چونکە لە ئەنجامدانی کاری چاکە و خێردا سەبرکردن هیچ واتایەکی نییە.

- کوڕی خۆم؛ وریابە لە هەموو کارەکانـدا دادپەروەری و ڕاستکرداری بکەیتە پیشە و، لە ڕێگەی ڕاستدا داوای سوود و قازانجی کارەکانت لە خوا بکە، نەک ئەوەی سوود و قازانجی کارەکانت لە ڕێگەی زیان گەیاندن بە خەڵکان بەدەستبهێنیت. بە شێوەیەک ژیان بەسەربەرە ئەگەر سوود و قازانجی کەمت لە ڕێگەی ڕاستەوە بەدەستهێنا باشترە لەوەی سامانێکی زۆر لە ڕێگەی زیان گەیاندن بە خەڵکان بەدەستبهێنیت.

- کوڕی خۆشەویستم؛ خزمەتکردنی خەڵکان ئەرک نییە، بەڵکو چێژێکی گەورە و ئاسوودەییەکی هەمیشەییە، ئەگەر ئەو پێگەیە بەدەستبهێنیت؛ ئەو کاتە لەناو جەستە و ڕۆحی خۆتدا هەست بە ئارامی دەکەیت. ئەو کەسانەی لە کارەکانیاندا لەخۆبایی و خۆپەسەندن و، لە ڕووی سامان و جوانییەوە خۆیان بە گەورەتر لەهەمووان دەبینن؛ ژیانیان هاوشێوەی گێژەڵووکەیەکە کە ساتێک هەیە و، ساتێک یاخی دەبێت و بە خێرایی لەناو دەچێت و کۆتایی دێت. ئەم کەسانە بە هۆی جەڵتەوە دەمرن.

- ئەی کوڕی شیرینم زۆر یادی خودا بکە، چونکە گەر کەسێک یادی خودا بکات خودای گەورەش یادی ئەو کەسە دەکات.

- ئەی کوڕی خۆم با گوناهەکانت هەمیشە لەبەر چاوت بن، چاکەکانیشت پشت گوێ بخە لە گوناهەکانت پەشیمانبە و چاکەکانت بەزۆر مەزانە.

- ئەی کوڕی شیرینم هەرکاتێک گوناهبارێکت بینی قسەی پێ مەڵێ لەو کاتەدا گوناهەکانی خۆت بێنەوە یاد چونکە تۆ تەنیا پرسیاری کردەوەکانی خۆتت لێدەکرێت.

- ئەی کوڕی خۆم گوێڕایەڵی خودا بکە، چونکە هەرکەسێک گوێڕایەڵی خودا بکات هەرچی ئاوات و مەبەستی هەیە بۆی جێبەجێ دەکات و لە خراپەی خەڵکیش دەیپارێزێت.

- ئەی کوڕی خۆم گوێ بە دنیا مەدەو دڵت پێی خۆش نەبێت چونکە تۆ بۆ ئەوە دروست نەکراویت.

- کوڕی خۆم خودای گەورە هەرشتێکی لە دنیادا دروست کردبێت زۆر ئاسانتر بووە لەلای لە دروستکردنی خودی دنیا، چونکە هیچ خۆشیەکی نەکردوە بە پاداشت بۆ چاکەکاران و هیچ ناخۆشیەکیشی نەکردووە بە سزا بۆ خراپەکاران.

- ئەی کوڕی خۆم ئارام بگرە و خاوەن باوەڕبە و جیهادی نەفست بکە، بزانە کە ئارامگرتن بڵندی و گەورەیی و بەزەیی و دنیانەویستی و هەستکردن بە چاودێری خودای تێدایە.

- کوڕی خۆم هەرکاتێک لە بەرامبەر حەرامدا ئارامگر بویت و دنیات بە کەم گرت و نارەحەتیەکانت لەلا هیچ نەبوو، ئەوکاتە هیچ شتێک لە مردن بەلاتەوە خۆشتر نابێت و چاوەڕێی مردن دەکەیت.

- کوڕی خۆم لەیادی خودا بێ ئاگا مەبە و لە خودا بترسە و با کەسیش پێت نەزانێت و خەڵکی لەخۆبایت نەکەن و بەقسەی نەزان نەخەڵەتێی، چونکە بەڕاستی تۆ مرواریت لە دەستدایە و وا دەزانیت پشقلە.

- کوڕی شیرینم نەرم و نیان بە هەمیشە هاوڕێی چاکبە.

- ئەی کوڕی خۆم هەرکاتێک خودای گەورە نیعمەتێکی پێبەخشیت، با شوێنەواری نیعمەتەکە ببینیت بەسەرتەوە  بە سوپاسگوزاری بۆی و خۆ بەکەمزانینت بەرامبەری و چاکە کردن لەگەڵ خەڵکیدا.

- کوڕی خۆم هەموو شتێک بەڵای خۆی هەیە، بەڵای کردەوەی چاکەش لەخۆڕازیبونە.

- ئەی کوڕی خۆم ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان لە هەموو کارێک چاکترە.

- ئەی کوڕی خۆم لەگەڵ کۆمەڵێکدا دابنیشە کە یادی خودا بکەن، چونکە ئەگەر زانابیت ئەوا زانستەکەت سودت پێدەگەیەنێت، خۆ ئەگەر نەزانیش بیت فێری شتت دەکەن، ئەگەر بەزەیی خودا یان ڕۆزی خودا داباری بەسەریاندا ئەوا تۆش بەشدار دەبیت تێیدا.

- کوڕی شیرینم لەگەڵ کۆمەڵێکدا دامەنیشە کە یادی خودا ناکەن، چونکە ئەگەر نەزان بێت ئەوا زیاتر نەزانت دەکەن، ئەگەر زاناش بێت ئەوا زانستەکەت سودت پێناگەیەنێت، ئەگەر نەفرەتی خودا یان تورەیی خودا دابارێت بەسەریاندا، ئەوا تۆش بەشدار دەبی تیایدا.

- کوڕی خۆم سوپاسی کەسێک بکە کە چاکەت لەگەڵدا دەکات و چاکە لەگەڵ کەسێک بکە کە چاکەت لەگەڵ دەکات.

- کوڕی خۆم نیعمەت بەهۆی سپڵەییەوە لەناو دەچێت و بەهۆی سوپاس کردنیشەوە دەمێنێتەوە.

- ئەی کوڕی شیرینم بەڕاستی دنیا دەریایەکی قوڵەو خەڵکانێکی زۆر تێیدا خنکان، با کەشتیەکەت تێیدا تەقوای خودا.و کردەوەی چاکە ئەو تێشوەت بێت کە هەڵیدەگریت، هەوڵبدە با تێیدا قازانج بکەی، ڕۆژەکانی شەپۆلی دەریاکەن و کتێبەکەی خوداش ڕێنیشاندەرە و گێڕانەوەی نەفس لە ئارەزوو حەبلەکانیەتی و مردنیش کەنارەکەیەتی و قیامەت سەختە و تۆ دەچیت بۆ ئەوێ و فەرمانڕەواش لەوێ هەر خودایە.

- ئەی کوڕی شیرینم تۆبە کردن دوامەخە، چونکە لەپڕ مردن یەخەت پێدەگرێت.

- ئەی کوڕی شیرینم ئەگەر ویستت هاوڕێیەتی کەسێک بکەی سەرەتا تووڕەی بکە، ئەگەر لەکاتی توڕەییەکەیدا ئارامی گرت ئەوا باشە ئەگەر نا ئەوا هاوڕێیەتی مەکە.

- ئەی کوڕی خۆم لەو ڕۆژەوە کە تۆ هاتویتەتە دنیاوە، تۆپشتی تێدەکەیت و لە قیامەت نزیک دەبیتەوە و بەرەو لای دەڕۆیت.

- ئەی کوڕی خۆم خۆت لە قەرز کردن بپارێزە ، چونکە دەبێتە هۆی زەلیلی ڕۆژ و خەفەتی شەو.

- ئەی کوڕی خۆم هەمیشە بڵێ ئەی خودایە لێم خۆشبە، چونکە هەندێ کات هەیە پاڕانەوە تێیدا گیرا دەبێت.

- ئەی کوڕی شیرینم لەو کەڵەشێرە زیرەکتربە لەکاتێکدا ئەو لەگەڵ بەرەبەیاندا دەخوێنێ و تۆش لەناو جێگەکەتدا خەوتویت.

- کوڕەکەم وریابە و دڵنیابە! ئەو کەسانەی لەسەر لووتکەی چیا وەستاون، با دەیانجووڵێنیت و ساتێک بە هۆی هەڕەشەی با، لە بەرزایی دەکەونەخوار و لەت لەت دەبن و لەناو دەچن.

- کـوڕم وریـابە! بـۆ گەیشـتن بە خـوا کە بەرزتـرین بڵنـدییە، لە کارەکـانی ڕۆژانە وردبـین بیـت و، هەمـوو کـردار و ئاکـار و بیرکردنەوەکانـت خواپەسـەندانە بێـت و، لەسـەر بنەمـای ڕەزامەنـدی خواوەند و ڕێنیشاندانی خەڵکان ئەنجامی بدەیت. لە خـوا داواکارم تۆ و هاوڕێکانت لەناو ئەو کەسانەدا بن کە خەڵکان بۆ شـاڕێگەی ڕاسـتی ڕێنوێنی دەکەن.

- کوڕم؛ دڵنیابە کاتێک ژیانت شیرین و ڕوونـاک و نـوورانی دەبێت و، زەمانێک ڕۆحت ئۆقرە دەگرێت کە هەمـوو فکر و ئەندێشـەکانت و، هەمـوو گوتارەکانـت بە درێژایـی ژیـان ڕاسـت و خواپەسـەندانە بێت، دڵنیـابە پـێش ئەنجامـدانی کارەکـان بیریـان لێبکەیـتەوە، ئەو کـات تێدەگەیت کە باش و خراپ کامەیە و، کارە باشەکە ئەنجام دەدەیت.

- کوڕی ئازیزم؛ تەمەنی تۆ ئەوەنـدە درێژ نییە کە جارێـک ڕێگەی ژیـان ئەزمـوون بکەیـت و، جـارێکی دیـکە بـۆ کەڵـک وەرگـرتن لە ئەزموونەکانـت بگەڕێیـتەوە بـۆ دنیـا. ئاگـاداربە! کـات کەمە و ڕێـگە کـورت، دەبێت لەم ڕێـگە کـورتەدا کە نە چـرا هەیە و نە ڕێنیشـاندەر؛ بەدڵنیـاییەوە هەنگـاو بنێیـتە ئەم ڕێـگەیە کە ڕوونـاکییەک نیـیە تـاکو سەرەتای ژیان و ڕێگەکەتی پێ ڕووناک بکەیتەوە. لێرەدایە کە دەبێت پشـت بەخـوا ببەسـتیت و، بە ڕاسـتکرداری و زیکـر و پـاڕانەوەی بەردەوام، ڕێگەی ژیانت بە نووری دوعاکان ڕووناک بکەیتەوە.

- کوڕی خۆم؛ وریا بە شەیتان لە ڕێگەی دنەدانی مێشکت هەوڵ دەدات ڕۆحت ناچار بکات لێکۆڵینەوە لە چارەنووسی داهاتوو بکات و، بەمشێوەیە ببێتە هۆی لاوازی تۆ. شەیتان هەرگیز لە تۆ دوور ناکەوێتەوە و، بەردەوام لە ڕێگەی دنەدان و هەڵخزاندنەوە، مرۆڤ بەرەو دنیای خەونە دوورەکان پەلکێش دەکات و، هەوڵ دەدات ڕۆحی تۆ بە خەون گرفتار بکات. کوڕم وریابە! ڕۆحی تۆ لە ڕێگەی زیکر و ڕاستکرداری بۆ ڕۆحێکی گەورەی ئیلاهی بگۆڕدرێت کە تەنیا و تەنیا بیر لە ئاياتی خواوەندی بکاتەوە.

- کوڕەکەم؛ ئەو کەسانەی بە دوای گەشەپێدانی ڕۆحیانەوەن و، دەخوازن لە گوناهەکان پاک ببنەوە و، ڕۆحیان نوورانی و گەشاوە بێت؛ ڕۆحی خەمباری ئەوان تەنیا لە تەنیایی و خەڵوەت و لە ڕێگەی زیکری خواوەندەوە ئۆقرە دەگرێت و لە مرۆڤەکان دەترسێت، چونکە ئەگەر مرۆڤەکان لێی نزیک ببنەوە شەیتان لە ڕێگەی ئەوانەوە ناچار بە زەمکردنی دەکات و، ڕۆحی تاریک و ڕەش دەبێت، کەواتە ئەو هاوشێوەی ئاسکێکی بریندارە کە لە ڕەوەکەی بەجێماوە، چونکە ئەگەری هەیە دڕندەکان (شەیتان و شوێنکەوتەکانی) پەلاماری بدەن. لێرەدا ئاسک پەنای بۆ ئەشکەوت بردووە بۆ ئەوەی لەوێ چاک ببێتەوە، یا بمرێت. کوڕم ئاگاداری دڕندەکان بە!

- کـورِم؛ جەسـتە و لاشـەی تـۆ هاوشـێوەی کەشـتییەکە کە دوو کەشـتییەوان و ڕێنیشـاندەری هەیە کـاری تیـا دەکەن و، ژیـانی تیـا بەسـەر دەبەن و، ئەو کەشـتییە گەشـتیارێک (یا کەسـایەتییەک) بەرەو ئامانج دەبات و، ئەو گەشتیارە دەخوازێت بەخاڵی کۆتایی بگات.

بەسـەرهاتی ئەو کەشـتییە جەسـتە و لاشـەی تـۆیە و، ئەو دوو کەشتیوانە یەکیـان فریشتە و، ئەوی دیکەیـان شـەیتان و، گەشـتیارەکە ڕۆحـی تـۆیە. ئەمەش پەیوەندیـدارە بە بـارودۆخی کەش و هەوا و تۆفانی دەریاوە و، کەش و هەوا و تۆفـانی دەریـا کـار و کردەوەکـانی تۆیە. کەشوهەوای دەریا دەبێتە هۆی ئەوەی کام لە کەشـتییەوانەکان سـوکانی کەشـتییەکە بگرێتەدەسـت؟ ئەگەر کردەوەکـانی تـۆ ڕاسـت و پەسند بێت، بەردەوام فریشتەیەک پارێزگاری لە جەسـتە و ڕۆحـی تـۆ دەکـات، بەڵام بە پـێچەوانەوە شـەیتان هاوشـێوەی کەشـتییەوانێکی خراپەکار کەشتییەکە نغرۆ دەکات و، ناتباتە خاڵی کۆتایی کە گەیشتنە بە خواوەند.

- کورِەکەم؛ هەمیشە هەوڵ بدە هاوشێوەی چیایەک بیت کە بەفـری لـێ بـاریوە و، سـەرچاوەیەکی ئـاوی تیـا دروسـت بـووە و، لەو سـەرچاوەیە هەزاران جووتیـار و وەرزێـر بـۆ پەروەردەکردنـی بـاخ و بەروبوم و مەڕومالات سوودی لێوەردەگرن. کەواتە جەستە و ڕۆحی تـۆ هاوشـێوەی چیـایە و، زیکـر و ئایەتەکـانی خواوەنـد و، عەقـڵ و تێگەیشتن و دەرکی تۆ هاوشێوەی بەفرە، لەبەر ئەوە تا ئەو جێگەیەی دەتوانیـت لەم عەقڵ و وشـیاری و دەرکەی خـۆت کە خواوەنـد پێـی بەخشـیویت فەرمـان بە چـاکە بـکە و خەڵکـیش لە خراپییەکـان دووربخەرەوە.

- کـوڕی خۆشەویسـتم؛ هەوڵ بـدە و وریـا بە کە جەسـتەی تـۆ هاوشێوەی قەڵایەکە و، ڕۆحی تۆ فەرماندەی قەڵاکەیە و، زمـان و و چاو و گوێچکەت پارێزەرەکانی قەڵان و، خواوەند فەرماندەی گشتی هەمـوو فەرمانـدەکانە. تـا ئەو کـاتەی زمـانی تـۆ سـەرقاڵی زیکـری خواوەند و ڕاستی و ڕێنیشاندانی خەڵکانە و، چاوی تۆ بە گوناهەکان پیس نەبێت و، گـوێچکەت زەم و خراپەکـاری و تـۆمەت نەبیسـتێت، پەیوەنـدی فەرمانـدەی قەڵا لەگەڵ فەرمانـدەی گشـتی بەهێـزە و، فەرماندەی گشتی (خودا) ڕێنوێنیتـان دەکات بۆ ئەوەی پارێزگاری لە قەڵاکە بـکەن، تـاکو فەرمانـدەی قەڵاکە بە زینـدوویی بمێنێـتەوە و، هەمووتان تەندروست و سەلامەت بن، بەڵام کوڕم دڵنیـابە شـەیتان و شوێنکەوتەکانی دوژمنی قەڵا و فەرماندەی قەڵا و پارێزەرەکانی قەڵان و، چەک و تەقەمەنی شەیتان و شوێنکەوتەکانی پەلەکردن و تووڕەیی و شـەهوەت و ئێرەیـی و تەمـاح و ڕژدیـیە. وریـا بە دەبێـت ڕێـگەی گەیشتنی چەک و تەقەمەنی بۆ شەیتانی و هاوەڵانی دابخەیت، چونکە ئەگەر ئەوان دەسـتیان بە چەک و تەقەمەنییەکـان بگـات سـەرەتا پارێزەرەکانی قەڵا لەنـاو دەچن و، دواتر* هێزەکـانی شـەیتان دێنە نـاو قەڵاکە و فەرمانـدەی قەڵاکە و، دواتـر خـودی قەڵاکە لەنـاو دەبەبـن. کوڕم وریای پارێزەرانی قەڵاکە بە!

- کوڕی ئازیزم؛ هەوڵ بدە هاوشێوەی گۆی زەوی بەهێز و خۆڕاگر بیت؛ کاتێک بارانی ڕەحمەتی خواوەندی بەسەریدا دەبارێت و، بە فەرمانی خودا هەموو جۆرە ڕۆزی و بەرەکەت لە زەوی دەڕوێت و، خەڵکان سوودی لێوەردەگرن و، هەمووان تێر و سەر زیندوو دەکات. وریابە! لە هەموو قۆناغەکانی ژیاندا هاوشێوەی چیا بەهێز بیت و، لە بەرامبەر کێشەکاندا خۆڕاگر و هاوشێوەی باران پاککەرەوە و زیندووکەرەوە بیت. پاککردنەوە و زیندووکردنەوەی تۆ واتە ڕێنیشاندانی خەڵکان و دوورخستنەوەیان لە خراپە و گوناهەکان. هەوڵ بدە خەڵک بۆ ڕێگەی خواوەند و ڕاستی ڕێنوێنی بکەیت بۆ ئەوەی هاوشێوەی باران پاککەرەوە بیت.

- ئەی کوڕی ئازیزم لە ڕەوشتی ناشرین و بێزاری و کەم خۆڕاگریت خۆت بپارێزە، ئەگەر لەسەر ئەم ڕەوشتە خراپانە نەبیت هاوڕێشت دەستدەکەوێت و خەڵکیش لێت دوور ناکەونەوە.

- کوڕەکەم؛ هەوڵبدە کاتێک ڕۆحت گەورە و نوورانی و ئیلاهی بوو، لەبەر ئەوەی وزە لە خواوەندەوە وەردەگرێت، بە تێڕامانی گەورەی ئیلاهی ناچارت بکات، هەڵبەت بەو مەرجەی هاوکاری لێوەربگریت و سوودی لێ ببینیت. لە ئێرەیی و بێزاری خۆت بەدوور بگرە، چونکە سەرەتا ڕۆحی خۆت بریندار دەکات و، دواتر دەبێتە هۆی ناڕەحەتی کەسانی تر. بۆ چارەسەری جەستە سەرەتا دەبێت ڕۆح چارەسەر بکەیت. بیرکردنەوەی و نییەتی دڵی تۆ جەوهەر و بوونی ڕۆحی تۆیە، کەواتە هەوڵ بدە بە نییەتی چاکە و بیرکردنەوەی ئیلاهی گەشە بە ڕۆحی خۆت بدەیت.

- کورِم؛ هەوڵبدە ڕۆحت لەم دنیا تێپەڕە بە نوورانی بمێنێتەوە. چونکە ژیان و تێپەڕینی تەمەن هاوشێوەی تێپەڕین لە شەوە، کە هەرچی لە شەودا زیاتر زیکری خوا بکەین و بیر لە ئایەتەکانی خواوەند بکەیتەوە؛ زیاتر ئۆقرە دەگریت و بەیانی زووتر دادێت و شادومانی بەدەستدەهێنیت، بەڵام ئاگاداربە! ئەو کەسەی خراپەکاری دەکات و بەردەوام بە درێژایی تەمەن سەرقاڵی کارە قێزەونەکانە، دنیای دوای مەرگی هاوشێوەی کەسێکە بەردەوام بە ڕۆژ بیری لە بیرکردنەوە شەیتانییەکان کردووە و، سەرقاڵی شەهوەت و کارە شەیتانییەکان بووە. هاوار لە ژیانی دوای مەرگی ئەو کەسە کە هاوشێوەی خۆرئاوابوونی دنیایە، تاریک و سارد و خەمبزوێن و ترسێنەر.

- کوڕی شیرینم کاتێک لای دەسەڵاتدارێک دانیشتی با جێگەی کەسێک لەنێوان ئەو و تۆدا بمێنێتەوە، نەوەک کەسێکی ئەو بێت و فیز بکات بەسەرتاو ببێتە ناتەواوی بۆ تۆ.

- کوڕی ئازیزم وریابە! ئەو کاتانەی لە بێدەنگی بەسەری دەبەیت، بێدەنگی تۆ لەبەر زیکری خواوەند و بیرکردنەوە لە فەرموودەکانی بێت، هەروەها بیر لە هاوکاری کەسانی دیکە و چاکەکاری بکەیتەوە، نەک ئەوەی بێدەنگی تۆ لە بێدەنگی بێزارکەری شەیتانی بێت، کە بەردەوام لە بیری خراپەکاری و هەڵخەڵەتاندنی خەڵک و، ستەم و خواردنی ماڵی حەڵاڵ و چەوساندنەوەی کەسانی دیکە بێت، چونکە ئەم بیرکردنەوەیە دەنگی زنجیری مردووەکانە و، ئەم دەنگی زنجیرە دەنگی زنجیرێکە دوای مەرگ لە ملی خراپەکار و بێبڕواکاندایە، وریای زنجیرەکانت بە!

- کوڕی خۆم ئاگادار بە! مردن کۆتایی ژیانی دنیاییە، بەڵام مردنی ئەم دنیایە سەرەتای لەدایکبوونێکی ترە لە دنیایەکی تردا، کوڕی خۆم ئاگادار بە! بە کردەوەی چاک و بیرکردنەوەی چاک لەدایکبوونێکی نوورانیت هەبێت، وەکو لەدایکبوونی گژوگیا لە بەهاردا. کوڕەکەم؛ هەروەها ئەوەشت لەبیر بێت کە مردن بە نزاکردن و چاکەکاری باشترە لە ژیانی بێ نزا و قوولبوونەوە. کەواتە کوڕی خۆم هەوڵ بدە مردنت لە لەدایکبوونت جوانتر بێت.

- کوڕم! ئاگادار بە! هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت کە جەستە و ڕۆحی مرۆڤەکان کاتێک ئاسوودە دەبێت کە زمانی خۆیان بەند بکەن و، زمانی خۆیان دوای مێشکیان بەکاربهێنن، واتە سەرەتا مێشکیان بەکاربهێنن و بیربکەنەوە، ئینجا دوای بیرکردنەوە زمانیان بەکاربهێنن و قسە بکەن. هەڵبەت بڕینی ئەم قۆناغانە دژوارە، بەڵام لە ڕێگای نەختێک پڕۆڤە و وردبوونەوەوە دەکرێت. کەواتە بەردەوام هەوڵبدە بەر لەوەی قسە بکەیت جوان بیربکەیتەوە.

- کوڕی خۆم وریا بە! ئەگەر دەتەوێت لە هەموو کارەکانتدا بەختەوەر و سەرکەوتوو بیت خۆم بەر لەوەی خۆت بکەویتە هەڵەوە و ببیت بە پەندی عالەم، هەوڵ بدە لە هەموو کارەکانتدا پەند لە کارەکانی ئەو خەڵکانە وەربگریت وا بەر لە تۆ ژیاون، یان ئێستا لەگەڵ تۆدا دەژین و، چاو لە بەسەرهاتی سەرکەوتن و دۆڕانی خەڵک ببڕیت و، لە ئەزموونەکانیان فێری وانە ببیت خۆم تاکو بە ئومێدی خوای گەورە لە کارەکانتدا سەرفراز و سەرکەوتوو بیت و، دڵنیابە هەر کەسێک لە کارەکانیدا پشت بە خوای گەورە ببەستێت هەرگیز تووشی شکست نابێت.

- کوڕەکەم، بزانە لەم دنیای فانی و کاتییدا هەرچی بچێنیت هەر ئەوە هەڵدەگریتەوە. بەڵام مرۆڤی باڵا و ڕاستەقینە و مەزن ئەو کەسەیە وا باشترینەکان هەڵدەبژێرێت و باشترینەکان دەچێنێت، بەلام بێ ئەوەی چاوەڕوانییەکی لە خەڵک بێت بەرهەمەکەی خۆی پێشکەشی دنیا و خەڵکەکەی دەکات. ئەو مرۆڤێکی ئازادیخوازە کە ڕۆحی مرۆڤەکان ڕزگار دەکات، نەک لە بەر ئەوەی خەڵک ستایشی بکەن و چەپڵەی بۆ لێ بدەن و خەلاتی بکەن، بەڵکو بۆ نوورانییەت و ڕزگاری و شیفای ڕۆحە مەزنەکان و، ئەو کەسانەیە وا لەم ڕێگا چاک و پیرۆزەدا شایەنی نوورانیبوون و سەرکەوتنن. هەر بۆیە خوای گەورە لەم ڕێگا مەزن و پیرۆزەدا لەگەڵیانە.

- کوڕی خۆم وریا بە! لە کاتی هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانت زۆر ورد بیت و بە باشی بیناسیت، چونکە هاوسەری باش و ژیر باشترین دیاریی خودایە، هاوسەری ژیر و باش دەتوانێت بە هەڵسوکەوتی باش و، قسەی شیاو و کردەوەی چاک، کاریگەری بخاتە سەر بیرکردنەوەی پیاو و، ببێت بە هۆی ئەوەی بیرکردنەوەی پیاو گەشە بکات و، لە هەموو کارەکانیدا سەرکەوتووی بکات، بەڵام هاوسەری نەزان و بێبڕوا خراپترین دوژمنی پیاوە، ئەو دەتوانێت بە ئیرەییبردن لە هەموو شتێک و، دەستتێوەردانی بێهۆ لە هەموو کارەکاندا، بیرکردنەوەی پیاو لەناو ببات و، ببێت بە هۆی ئەوەی لە هەموو کارەکانیدا تووشی شکست بێت. کەواتە زۆر وریا بە!

- کورِم ئاگادار بە! کاتێ کاری چاک دەکەیت ڕۆح و جەستەت ئاسوودە دەبێت. کاتێکیش ئاسوودە بوویت ئارامی تۆ دەبێتە هۆی بیرکردنەوەی باڵا، کاتێکیش بە شێوەیەکی باڵا بیرت کردەوە لەبەر چاوی خەڵک گەورە دەبیت و، دەگەیتە پلەیەکی باڵا. کاتێکیش لەبەر چاوی خەڵک گەیشتیتە پلەیەکی باڵا خەڵک هەمووی دەبێتە خزمەتکاری تۆ، ئەوەش ئەو کاتەیە کە تۆ هەم لە ڕووی ماددییەوە و، هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە گەشە دەکەیت، کاتێ کە لە ڕووی ماددی و ڕۆحییەوە گەشەت کرد دەتوانیت بە قووڵی بیربکەیتەوە و، بە شێوەیەکی باش کەڵک لەو سامانەی خوا پێی بەخشیویت وەربگریت.

- کورِم وریا بە! ئیرەییکردن لە هەموو کارەکاندا دەبێت بە هۆی گەندەڵی و سەرشۆڕی، چونکە ئیترەییبردن وات لێ دەکات بە باشی بیر نەکەیتەوە و، کەسێک کە بیر نەکاتەوە دەچێتە ڕیزی ئاژەڵانەوە. کەواتە ئاگادار بە! نەکەویتە ناو داوی خواستە دنیاییەکانەوە، چونکە بیرکردنەوە لە شتی مەحاڵ توانای بیرکردنەوەت سەرقاڵی خۆی دەکات و، بەردەوام ئازارت دەدات و، لە بیرکردنەوەی ژیرانە دوورت دەخاتەوە و، لە پڕ بە جەڵتەیەک دەتخاتە ناو دۆزەخەوە. کەواتە لە دنیا و قیامەت بێبەش دەبیت و، دوای مردن لە ئاسوودەیی ڕۆح بێبەری دەبیت.

- کوڕی خۆشەویستم؛ بە هۆی ئەو شتانەی نایانزانیت نیگەران مەبە، بەڵام بە شێوەیەکی باش کەڵک لەو شتانەی وەربگرە کە دەزانیت و، لە کارەساتەکاندا ئارام و خۆڕاگر بە و، وەکو نەزانەکان خۆت تووشی خەم و مەراق مەکە، چونکە ئەگەر خەم بخۆیت ئیتر ناتوانیت بە باشی بیربکەیتەوە و بە درێژایی ژیان لە کارەکانتدا تووشی شکست دەبیت، ئەوەش بزانە ژیان و مەرگ لە شەو و ڕۆژ دەچێت، چۆن دووری یەکێک دەبێت بە هۆی نزیکبوونەوە لە ئەوی تر، کەواتە بەم نزیکانە یان ڕۆژ دەبێتەوە یان دەبێت بە شەو. لە چاوی خەڵکی بێبڕوا و نەزانەوە بەم زووانە ڕۆژ ئاوا دەبێت، بەڵام لەبەر چاوی بڕوادار و چاکەکارانەوە بەم زووانە ڕۆژ هەڵدێت و ڕاستییەکان دەردەکەوێت.

- کوڕم وریا بە! لە هەموو کارەکاندا پشوودرێژی و خۆڕاگری دەبێت بە هۆی سەرکەوتن و دڵخۆشیت. هەر بۆیە لە کاری خێر و چاکەدا پەلە مەکە، هەڵبەت لە ڕێگای بیرکردنەوە و وردبوونەوەوە. گەورەترین پاداشتی تۆش بۆ خزمەتکاران و ئەو کەسانەی ژێردەستەتن ئەوەیە کە لە کاتی خۆیدا پاداشتی کارەکانیان بدەیت، ئەمە گەورەترین کەماڵ و نیشانەی گەورەیی تۆیە و، دڵنیابە دڵخۆشیی ئەو کەسانەی ژێردەستەی تۆن، دەبێتە هۆی ئەوەی بەخششی خوای گەورەت بەسەردا ببارێت، بەڵام ئەگەر خزمەتکار و ژێردەستەکانت لە تۆ ناڕازی بن دەبێت بە هۆی تووڕەیی و غەزەبی خوای گەورە و، لە کارەکانتدا تووشی کێشە و گرفتی زۆر دەبیت. کەواتە ئاگادار بە!

- کورِم؛ چوار شت هەن کەمن، بەڵام کەمیشیان هەر زۆرە و دەبنە هۆی تاریکبوونی ڕۆح و لاوازبوونی جەستە، ئەو چوار شتەش ئاگر و دوژمـــن و هەژاریـــی عەقـــڵ و نەخۆشـــییە. هەڵـــبەت ئەگەر لەم شتانەشدا پشت بە خودا ببەستیت و زیکری خوا بکەیت و، لە هەموو بابەتێکدا بیر بکەیتەوە، خوای گەورە یارمەتیت دەدات و ئاگای لێت دەبێت. هەروەها ئەوەش بزانە ئەمانەتداری و ڕاستگۆیی بەرەکەت و ڕزق و ڕۆزیـــت زۆر دەکـــات و، لە هەمـــوو کارەکانتـــدا هێـــزت پـــێ دەبەخشـــێت و، وات لـــێ دەکـــات بە ســـەر دوژمنەکانتـــدا زاڵ بیـــت. هەروەهـا ئەوەش بـزانە بەنرختـرین و گەورەتـرین قۆنـاغی ژیـری و ئەندێشـــە، بیرکـــردنەوەیە لە ئافرانـــدنی مـــرۆڤ. چـــونکە لە ڕێگـــای بیرکردنەوە لە ئافراندنی مرۆڤ لە تواناى خوداى گەورە تێدەگەین.

- کـورەکەم وریـا بە! لە هەمـوو کارەکانتـدا بەر لەوەی ئەنجامیـان بدەیت بیر بکەیتەوە و عەقڵت بەکار بهێنیت و ڕاوێژ بە خوای گەورە بکەیت، واتە هەر کەسێک بەر لە ئەنجامدانی کارەکانی بیربکاتەوە لە ڕاستیدا عەقڵی کە نێوانگری نێوان مرۆڤ و خودای خستووتە کار و، خوای گەورەش یارمەتی داوە. کەواتە ئاگادار بەڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە ڕێگای بیرکردنەوە عەقڵی خۆت نوورانی بکەیتەوە. هەروەهـا وریابە وەک چـۆن لە مـاڵ گواسـتنەوەدا کتێبێـک خێـرا بـزر دەبێـت هەر بەو خێراییەش بە هەڵگرتنی هەنگاوێکی هەڵە بیرکردنەوە و عەقڵیش لەنـاو دەچێت.

- کورم وریا به، ڕۆح و ئارامی و ژیانت وەکو تێپەڕین لە شەو وایە کە هەرچی خێراتر بڕۆیت زووتر دەگەیت بە سپێدە و ڕۆژ، کەواتە کورم ئاگادار بە! بە درێژایی ژیانت هەرچی لە خودا نزیکتر بیت و چاکەکاری بکەیت و بیر لە دنیای پاش مردن و ئایەتەکانی خودا بکەیتەوە؛ بە ئارامییەکی گەورە و جوانییەکی گەورە و، بە خێراییەکی ئاسوودەیبەخشەوە ئەم دنیای فانی و لێوانلێو لە سەختییە جێ دەهێڵیت و پێیدا تێدەپەڕیت، کەواتە ئاگاداری چۆنیەتی تێپەڕین لە شەو بە، چونکە ئەم دنیایە لە ڕوانگەی بڕوادارانەوە وەکو تێپەڕینە لە تاریکی.

- کوڕی خۆم؛ بزانە مەبەستی خوای گەورە لە ئافراندنی مرۆڤ گەشەکردن و نوورانیبوونی ڕۆحی ئەو بووە و، گەشەکردن و نوورانیبوونی ڕۆحی بنیادەم لە ڕێگای چاکەکاری و زیکری خودای گەورە و ڕێنوێنی خەڵکەوەیە، کە بنیادەم دەگاتە پلەی ئینسانییەت و گەورەیی لەبەر چاوی خوای گەورە و، هەر کەسێک بگاتە پلەی ئینسانییەت دەگاتە پلەی باڵا، تەنانەت باڵاتر لە فریشتەکان، کەواتە ئاگادار بە دانەبەزیت و هیچ شتیک هێندەی زۆر خۆری و بێکاری ڕۆحی مرۆڤ تاریک و لێڵ ناکات.

- کــوڕەکەم؛ ئەگەر دەتەوێــت لە وەڵامــی پرســیارەکانی ڕۆحــت تێبگەیت، ســەرەتا دەبێت لە داگیرکردنی هەموو بەشەکانی جەستەت دەست پێبکەیت و، دەبێت ڕۆحت وەکو گوڵێک وا هێزی خۆی لە خاک دەگرێت و گەشــەدەکات و بە ناسکی و بۆنی خۆش گەورە دەبێت، ژیان و دنیای جەستە لە ڕێگای چاکەکاری و زیکری خوای گەورە هێز و توانا وەربگرێت و، بە گەشاوەیی و عەتر و بۆنی خۆش و بە ناسکییەوە لەم دنیای خاکییە بفڕێت، وەکو پەڕەی گوڵەکان کە دوای ئەوەی بوون بە خونچە پاش ماوەیەک بە دەم شنەی باوە لە هەوادا بڵاو دەبنەوە.

- کوڕم وریا بە! بیرکردنەوە دەبێت وەها بێت کە هەم بیر لە دنیای ڕۆحی و پاش مردن بکەیتەوە و، هەم ئاگات لە دنیای جەستەیی و ڕۆژانە بێت، چونکە تۆ جارێ هێشتا لە دنیای جەستەدا دەژیت و، دەبێت بیرکردنەوەت وەها بێت کە لە هەموو قۆناغەکاندا، چ قسەکردن بێت، چ کردەوە و ئەندێشــە، لە ڕێگای ڕاســت و دروســتەوە گەشــە بکەیــت تــاکو بەمجــۆرە بتوانیــت بگەیــت بە ڕۆحێکــی بــاڵا و گەورە. هەروەهــا ئەمەش بــزانە لەبەر ئەم هۆکــارەیە مرۆڤەکــان لە دنیــای ڕۆحەوە هــاتوونەتە دنیــای جەســتە؛ دەنــا مــرۆڤ کــائینێکی ئاســمانی بووە.

- کـورِم؛ بـزانە و ئاگـادار بە دەبێـت تـۆ لە قسـە و کـردەوە و ئەندێشەی دروست لە خەڵک سەرتر بیت، تاکو بتوانیت لەم ڕێگایەوە ژیانی خۆت خۆش بکەیت، هەروەها کوڕی خۆم وریا بە! یەکێک لە خراپتـرین تایبەتمەنـدییەکانی مـرۆڤ ئەوەیە کە ئەرکەکـانی خـۆی بەرامـبەر بەو کەسـانەی بەرپرسـە لێیـان بەجـێ نەهێنێـت (وەک یارمەتیدانی باوک و دایک و ...هتد)، چونکە ئەو بەرامبەر بە کەسانی تر بەرپرسیاریتی لەسەر شانە و، بە جێگەی نەهێناوە و پەیمانشکێنی کـردووە. هەروەهـا هەوڵ بـدە هەمیشـە جۆرێـک قسـە بکەیـت کە لە ئەندێشـە و بیرکردنەوەیەکـی پـاکەوە سـەرچاوەی گرتبێـت و ئەمە کارێکە کە تۆ بە ئەندێشەی پاک و هەوڵدان کردووتە.

- کوڕەکەم وریـا بە! وەهـا مـامەڵە لەگەڵ خەڵـک بکەیـت کە خـۆت چاوەڕێی بەو شێوەیە مـامەڵەت لەگەڵ بکەن. ئەوەش بزانە! کەسێک کە نەتوانێـت دژی خواسـتە نەگونجـاو و شـەیتانییەکانی خـۆی بوەسـتێتەوە؛ ناتوانێـت بەسـەر شـتەکانی تـردا زاڵ بێـت. هەروەهـا ئەوەش بزانە! کە بەخششی خودا بۆ مرۆڤەکان، بە ئەندازەی نیاز و بیرکردنەوە مەعنەوییەکانی ئەوانە. هەروەها ئاگادار بە! کاتێک هەوری ئیرەیی بەسـەرتدا باری ئەو کاتەیە کە ئیتر جەسـتەی تۆ دەگەنێت و لەناو دەچێت. هەروەهـا عیشق بە خـوای گەورە هێز و توانا بە ڕۆح دەبەخشێت و، دەبێت بە هۆی تەندروستی و بەهێزبوونی جەستە.

- کورِم وریا بە! غەزەب و تووڕەیی و ڕق و کینە ڕۆحت تاریک دەکەن و، دەیپووکێننەوە، کەواتە ئاگادار بە! ڕۆحی مرۆڤ کائینێکە بە کاری چاکە نووراني و ئاسوودە دەبێت. هەروەها دڵنیابە زەوی و هەموو ئەو شتانەی تێیدان دەگۆڕێن و لەناو دەچن، بەڵام خودا هەتاهەتاییە و ڕۆحی مرۆڤ بە چاکەکاری و گوتنی زیکری خودا جاویدانی و زیندوو دەمێنێت. وەکو دارەکان و ئەو بوونەوەرانەی بە ئاو زیندوون و بێ ئاو وشک دەبن و لەناو دەچن.

- کورِم وریا بە! وەک چۆن غەم و مەراق ڕۆح دەفەوتێنێت، زۆربلێییش دەتوانێت لەبەرچاوی خەڵک سووکت بکات، کەواتە ئاگادار بە! بێدەنگ بیت تاکو خەڵک لەگەڵ تۆ قسە بکەن و، ئەوسا تۆ سەرەتا بیر بکەیتەوە ئینجا قسە بکەیت باشترە لەوەی تۆ بەردەوام قسە بکەیت و قسەکانت بێهودە بن و، بە هۆی قسە بێهودەکانت خەڵک وەڕەس ببن و، بە توانج لێدان بێدەنگت بکەن. هەروەها دڵنیابە هەر کەسێک گوێ لە ئەزموون و ئامۆژگاری و قسەی خەڵک بگرێت و بە بیرکردنەوە سەرقاڵی فێربوون بێت فێری ئەزموونی بە نرخ دەبێت.

- کوڕی خۆم؛ چاکەکاری و قسەی چاککردن پارەیەکی زۆری ناوێت، بەڵام دەبێت بە هۆی ئەوەی مرۆڤەکان خۆشیان بوێت و گەنجینەکانی ئاسمان دەبێت بە نسیبت، ئەوەش بزانە هەرچی بیرکردنەوەت بالاتر و مەزنتر بێت بە هەمان ڕادە و، تەنانەت پتر لەوەش خوای گەورە لە دنیا و لە قیامەتدا بەختەوەریت پێ دەبەخشێت. گرنگ نییە چی دەخۆیت و چی لەبەر دەکەیت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە قسە و کردەوە و بیرکردنەوەت چەندە پاک و خودایی بێت و، کاتێک قسە و کردەوە و ئەندێشەت خودایی بوو لە هەموو شوێنێکدا هەست بە هەبوونی خودا دەکەیت و، ئیتر پێویستت بەوە نییە بڕۆیتە ناو ئەستێرەکانەوە. هەروەها وریا بە ئەگەر هەموو سامانی خۆت ببەخشیت، بەڵام قسە و کردەوە و ئەندێشەت ناحەز و شەیتانی بێت، بەخششەکەت هیچ بایەخێکی نابێت و هیچ سوودێکی لێ نابینیت. ئەوەش بزانە ژیانی هەر کەسێک کە دوور بێت لە بیرکردنەوە هیچ بایەخێکی نییە. کوڕی خۆم؛ ئەگەر دەتەوێت لە لای خەڵک و خوا خۆشەویست و گەورە بیت، دەبێت عەقڵت بەسەرتدا زاڵ بێت و، بێ فەرمانی عەقڵ و ڕاوێژکردن بە خوا دەست بۆ هیچ کارێک نەبەیت. ئەوەش بزانە ژیان جوانە، بەڵام نەک هێندەی جوانیی حەقیقەت، هەروەها حەقیقەت تاڵە نەک بە ئەندازەی دۆزەخ؛ کەواتە ئاگات لە خۆت بێت!

- کوڕی خۆم ئاگادار بە! چاکەکاری و زیکری خوای گەورە و کار و تێکۆشـــان ڕۆژەکانــت کــورت و تەمەنــت درێــژ دەکــاتەوە. ئەو کەسانەش کە دەڵێن کاتیـان کەمە ئەو کەسـانەن وا کەمتـر کار دەکەن و، زیـاتر سـەرقاڵی چێژە شـەیتانییەکانن، ئەوەش بـزانە قسـەکردن و ئامۆژگاری چاکەکاران باشـترە لە کـاری چـاک و، قسـەی خراپەکاران خراپترە لە کاری خـراپ. دڵنیاش بە بۆ ئەو کەسـەی بڕوادارە کـاری مەحـاڵ بـوونی نییە. هەوڵ بدە لە خەڵکەوە فێری زانسـت و عەقڵ و ئەندێشە و ئەزموون ببیت، بەڵام ژیرانە و لە ڕێگای بیرکردنەوەوە.

- کـوڕەکەم؛ چاکەکـاری و زیکـری خـودا چێژێکـی زۆری تێـدایە و، مـرۆڤ کە بە چێـژەوە فێـری شـتێک بـوو ئیتـر هەرگیـز فەرامۆشـی ناکات. ئەوەش بزانە کە لە هەڵبژاردنی هاوڕێدا دەبێت زۆر وریـا بیت و، هـاوڕێ و هاونشـینت دەبێـت کەسـێکی لەخـواترس و خودانـاس و چاکەکار و بیرکەرەوە بێت، هەروەها دەبێت هـاوڕێکەت کەسـێک بێت کە کاتێ کە لەگەڵ ئەویت هەست بکەیت لەگەڵ خۆتدایت. واتـا قسـە و کردەوە و بیرکردنەوەی هاوڕێیەکەت دەبێت وەکو خۆت بێت.

تۆ و من = زیکری خودا و چاکەکاری و بیرکردنەوە.

- کورِم وریـا بە! بە شـێوەیەک بژیـت کە لە ڕێگـای چاکەکـاری و زیکری خـودای گەورەوە ڕۆحت بگەیـت بە ئاسـتێکی بـاڵا، بـۆ ئەوەی دوای مردن ڕۆحت بەرەو ئاسمان بفڕێت و، لە خـودای گەورە نزیـک ببێتەوە، چونکە کردەوەی چاک و زیکری خودای گەورە ڕۆح دەبـات بۆ ئاسمان. جەستەیشت بە گۆڕ دەسپێردرێت و دەبێت بە خـاک و، بە چـاکەکردنەکە نـاوت لە زەویـدا دەمێنێـتەوە و، هەمیشـە گەورە و جاویـدانی دەمێنیـتەوە. کەواتە هەوڵ بـدە چاکەکـار بیـت و بـۆ یەک چرکەش لە یادی خـودا غافڵ نەبیت، چـونکە ئەگەر لە یـادی خـودا و چاکەکـاری غافـڵ بیـت نـاو و ڕۆح و جەسـتەت دەچـنە نـاو گـۆڕ و هەموویان دەسرِدرێنەوە.

- کورِی خۆشەویستم؛ ڕێگای پرۆڤەی بێدەنگی دوورکەوتنەوەیە لە قسـەی بێهـوودە و ناپێویسـت. ئەوەش بـزانە ئەگەر هەوڵ بـدەیت هەمیشە لە کاتی پێویستدا قسـە بکەیت؛ ئەو کاتە دەتوانیت گوێ لەو ڕێنوێنییـانە بگریـت کە لە لایەن خـوای گەورەوە پێـت دەکرێـت، ئەو کـاتەیە کە لە هەمـوو کارەکانتـدا سـەرفراز و سـەرکەوتوو دەبیـت. هەڵبەت بەو مەرجەی کەمتـر قسـە بکەیت و زیـاتر بیـر بکەیـتەوە و، پشوودرێژ بیت و، زیکری خوای گەورە بکەیت.

- کوڕم وریا بە! بێدەنگی ساکارترین ڕێگایەکە کە دەتوانیت لەو ڕێگایەوە زەین و مێشک و هۆشت بەهێز بکەیت، بەڵام ئەگەر بێدەنگییەکەت لەگەڵ زیکری خودا تێکەڵ بکرێت زەینت بەهێزتر و نوورانی تر دەبێتەوە؛ ئەوەش ئەو کاتەیە کە بۆ ئەنجامدانی هەر کارێک دەتوانیت بە باشی بیر بکەیتەوە و لە کاتی بێدەنگیدا توانای مەعنەوی و وزە ئافرێنەرەکانی جەستەت بەهێز دەبنەوە و، پێکەوە دەبن بە هۆی دروستبوونی ئارامییەکی سەیر لە جەستەتدا و، ڕۆحت نوورانی و گەورە دەکەنەوە و، ڕۆحت پەیوەست دەکەن بە دنیای بێدەنگییەوە و دەیخەنە ناو کارگەی ئینسانسازیی خودا و، دەتگەیەنن بە ئاستێکی باڵا.

- کوڕی شیرینم ئاگادار بە! هەرگیز لەگەڵ نەزانەکان و ئەو کەسانەی لە ئیمان و عەقڵ و بیرکردنەوە بێبەشن نەکەویتە مشتومڕەوە، چونکە ئەو کەسانەی سەیری تۆ و ئەوان دەکەن لەوە نەزانترن ڕاست لە هەڵە جیا بکەنەوە و، لە ڕاستیی ئەو شتەی تۆ باسی دەکەیت تێبگەن؛ کەواتە ئاگادار بە و ئەوەش بزانە کاتێک کۆترێک لەگەڵ قەلەڕەشێک دادەنیشێت و دەبن بە هاوڕێ؛ باڵەکانی کۆتر سپی دەمێنن، بەڵام دڵی و بیرکردنەوەی وەکو قەلە ڕەشەکە ڕەش دەبێت. کەواتە کوڕی خۆم لە کاتی هەڵبژاردنی هاوڕێ و هاونشین و هاوبەشی کارەکانت وریا بە! چونکە ئەو دەتوانێت وا لە تۆ بکات بیرکردنەوە و کردەوە و قسەکردنت وەکو خۆی لێ بێت.

- کوڕەکەم وریا بە! هەرگیز فەرامۆشی مەکە کە مرۆڤەکان دوو گوێیان هەیە و زمانێک، کەواتە دەبێت دوو هێندەی ئەو شتەی باسی دەکەن، ببیستن. کەواتە گوێگرتن باشترە لە قسەی بێهوودەکردن، ئەوەش بزانە تێگەیشتن باشترە لە فێربوون. هەروەها مەبەستی سەرەکی لە ژیان فێربوونی زانست نییە، بەڵکو ئەنجامدانی ئەو شتانەیە وا فێریان بووین. هەروەها لە هەندێ کاتدا قسەکردن سەبارەت بە کێشەکان لەگەڵ ئەو کەسانەی لە خودا دەترسن و متمانەپێکراون؛ دەبێت بە هۆی چارەسەرکردنی بەشێک لە کێشەکان.

- کوڕی خۆم وریا بە! ئەگەر خەڵک نەتناسن کێشە نییە، بەڵام ئەگەر تۆ خەڵک نەناسیت دەبن بە هۆی خەم و مەراق و دۆڕانی تۆ. ئەگەر دۆستەکانیشت بێبڕوا بن دواجار دەبن بە دوژمنت، ئەوەش بزانە کە دۆستایەتی و دوژمنایەتی کەسانی هەستیار کاتییە. ئاگاداری ئەمەش بە چەند شتێک هەن شارەوە بن باشترە لەوەی ئاشکرا و دیار بن، وەک؛ پێویستی، یارمەتیدانی خەڵک، کێشە و ئازار و کارەسات. هەر شتێک سەرنجڕاکێش و دڵخواز بێت بۆ گەیشتن پێیان نە ئاسوودەیی هەیە و نە سەختی، بەڵکو سەختی کێشان دەبێت بە هۆی گەیشتن بە ئارامی و ئاسوودەیی.

- کورِم ئاگادار بە! گشت بوونەوەرەکان لە نەبوونەوە دێنەبوون، واتە خـودای گەورە سـەرەتا دنیـای ڕۆحـی و ڕۆحەکـان و ئەو بوونەوەرانەی کە بە چاو نابیندرێن خەلق کردووە و، لە ڕۆحەوە بۆ مـاددە جەریـانی هەیە. هەروەهـا لێکۆڵینەوە و گەڕان بە دوای دنیـای ئەبەدی و بیرکـردنەوە لە ئایەتەکـانی خـودا لە حـاڵەتە شـکۆدارەکانی ڕۆحی مرۆڤە و، ئامـانجی ڕۆح لە فکر و زەینیدا حەشـار دراوە و، لە ڕێگـای نیشـانەکانی دەرەوە نـاتوانین سـەبارەت پێیـان قسـە بکەیـن و، لەسەری حوکم بدەین و، گەورەیی ڕۆحی هەر کەسێک لە ڕێگای قسە و کرداریەوە دەردەکەوێت.

- کوڕەکەم؛ خەڵک دوعاکردن و زیکری خـودا بە کارێکی بێزارکەر دەزانن، ئەمە لە حاڵێکدایە کە دڵـی مرۆڤەکـان بـێ زکـری خـودا ئـازار دەچێژێت. ئایـا کەسـێک هەیە دڵە بێئـوقرە و ئـازار چەشـتووەکەیان ئـارام بکـاتەوە؟ ئایا کەس هەیە ڕۆحە پەرێشـانەکەیان ئـارام بکـاتەوە؟ ئایا کەس هەیە ڕۆحیان وەکو شنەی سروەی کوێستانان سووک و گەش بکاتەوە؟ ئایا کەس هەیە لە کاتی تووڕەییدا ئـارام و دڵخۆشـیان بکات و وەکو ئاوی زوڵاڵی کانیاوەکانی لێ بکات؟ کەواتە کوڕی خۆم وریا بە! هەمیشە بە بێدەنگی و زیکری خـودای گەورە و بیرکـردنەوە لە ئایەتەکانی دڵخۆش بیت.

- کوڕی شیرینم؛ تۆ هەموو شەوێک بەر لەوەی خەوت لێ بکەوێت بڕۆ و لە سووچێکدا بە بێدەنگی بیر لە خوا بکەوە. ئەم سووچە بێدەنگە دەتوانێت تەنانەت دڵی تۆ بێت. واتە تەنانەت دەتوانیت لەناو جەنجاڵی و ژاوەژاوی خەڵکیشدا لە ڕێگای قووڵبوونەوەی زەینی و بیرکردنەوەوە، بە بێدەنگی زیکری خودا بکەیت و، دەتوانیت هەموو نیگەرانییەکانت؛ بۆ نموونە ئەگەر کارێکت کردووە دڵی کەسێکت ئێشاندووە، یان شتێکت گوتووە کە بووەتە هۆی ئازاری ویژدانت و هەست بە گوناە دەکەیت، ئەمانە هەموویان لە ڕێگای بێدەنگی و زیکری خودای گەورە و، بیرکردنەوە لە فکر و زەینی خۆت بسپێریتە دەستی خودای گەورە و، داوای لێخۆشبوونی لێ بکەیت، دڵنیابە خوای گەورەش بەخشندەیە.

-. کورم؛ زیکر کردنی خودا و بێدەنگی تاقە ڕێگایەکی متمانە بەخشنە کە دەتوانن لە کاتی خەم و کێشەکاندا ڕزگارت بکەن، ئەگەر نیگەرانی شتێک بیت دەتوانیت لە ڕێگای زیکری خوای گەورە بیسپێریتە دەستی خوا و، ئەگەر هەست بە تەنیایی دەکەیت و پێت وایە کەس خۆشی ناوێیت؛ دەتوانیت لە ڕێگای گوتنی زیکرەوە پەیوەست بیت بە خوای گەورەوە، ئەو کاتە دەزانیت هاوڕێیەتی لەگەڵ خوا بالاترین دۆستایەتییە و، هەموو دۆستایەتییەکان مایەی سزا و سەرگەردانین، کاتێک لەگەڵ خوا بوویت بە هاوڕێ واز لە هەموو شتێک دەهێنیت، ئەو کاتەیە کە ئیتر دەگەیت بە ئارامشێکی مەزن.

- کوڕی خۆم ئاگادار بە! هەموو خەم و فشار و عەسەبییەتەکان لەبەر نەمانی زکری خواوەندی گەورە لە جەستەی مرۆڤەکاندا دروست دەبێت و، دڵەکان گرانبار دەبن و، فرمێسک لە چاوەکاندا قەتیس دەبێت و، سەرچاوەی هەموو ئەو ئازار و خەمانە کە هەمیشە لە دڵی مرۆڤەکاندا نیشتەجێ دەبن نەبوونی زیکری خودایە لە زەین و دڵەکاندا و، دووری لە خودا هۆکاری هەموو ئەم کارەساتانەیە، کەواتە کوڕی خۆم؛ هەوڵ بدە بەردەوام لە ڕێگای زیکری خوداوە ڕوو لە جوانیی ئەبەدیی خودا بکەیت بۆ ئەوەی تاهەتایە لە ڕەنج ڕزگارت ببێت.

- کوڕم؛ خودا بەردەوام لە ڕێگای زمانە جیاجیاکانەوە مرۆڤەکان بەرەو چاکەکاری و زیکری خودا و ڕێنوێنی خەڵک ڕێنوێنی دەکات، کەواتە کوڕم تۆش هەموو کێشەکانت یەک بە یەک بسپێرە بە دەستی خودا و، خۆت بە زیکری خوداوە سەرقاڵ بکە، تاکو خودا ڕێگای ڕزگاربوون لە کێشەکانت پیشان بدات، چونکە خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت وا بە تامەزرۆییەوە زیکری خودای گەورە دەکەن و، لە دڵ و هزر و بیری خۆیاندا هەست بە هەبوونی ئەو دەکەن. هەروەها باشترین کاتەکانیان ئەو کاتانەیە وا هەست دەکەن لە لایەن شەیتانەوە بە هیچ شێوەیەک وەسوەسەیان بۆ دروست ناکرێت.

- کوڕی خۆم؛ دڵنیابە گوتنی زیکری خوای گەورە لە هیچەوە دەتگەیەنێت بە هەموو شتێک، بەڵام دەبێت بە وریاییەکی تەواوەوە هزر و بیری خۆت پەروەردە بکەیت و، بە وردبوونەوە لە ناوە مەزنەکانی خوای گەورە نوری ئیلاهی لە خۆتدا هەڵبکەیت. هەر کاتێکیش ڕووبەڕووی شتێکی ئەستەم و مەحاڵ بوویتەوە هزر و بیری خۆت پڕ بکەیت لە ناوە مەزنەکانی خوای گەورە و، تەنیا پێویستت بە وردبوونەوە و ئیمانی تەواوە، هەروەها بەدڵنیاییەوە بە دووبارەکردنەوەی ناوی خوا دەبینیت هێزێکی گەورە لە ناختدا دروست دەبێت، ئەوەش لەو کاتەدایە کە بە بێدەنگی و بە زیکری بەردەوامی خوا دەگەیتە ئەنجامێکی باش.

- کوڕی خۆشەویستم؛ ئەوە بزانە کە هەتاو گەرما و ڕووناکیی خۆی بە ڕووەکێک دەبەخشێت کە سەری لە خاک دەرهێنابێت. کەواتە تۆش تەنیا زەمانێک دەتوانیی سوود لە ڕووناکی و ئارامیی خودا ببینیت کە بیر و ڕۆحی خۆت لەم زەوییە خاکییە بهێنیتە دەرەوە و، بیر لە دنیای ماددی نەکەیتەوە، ئیتر لەو کاتەدایە کە ڕۆحی تۆ دەکەوێتە ژێر نووری خوای گەورە و، ڕۆحت ئارام دەبێتەوە و، سوود لە نیعمەتەکانی خودا دەبینیت.

- کوڕی شیرینم ئاگادار بە! دەرمانی هەر دەردێکت لە خودا بوێت و، لە هەموو بارودۆخێکدا سوپاسگوزاری خوای گەورە بیت و، هەوڵ بدە لە هەموو ساتەکانی ژیانتدا لە زیکر و عیبادەتی خودای گەورە غافڵ نەبیت و، لە هەر کار و هەر هەنگاوێک و هەر جووڵەیەکدا هەرگیز خوای گەورە فەرامۆش نەکەیت، ئەوەش بزانە تەنانەت لە کاتی ترس و نائومێدی و دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و پەرێشانیدا زیکر و یادی خودای گەورە لە دڵ و ڕۆحت دوور نەکەویتەوە، ئەوسا بۆت دەردەکەوێت کە چۆن سەرڕێژ دەبیت لە ئاسوودەیەکی گەورە. هەتاکو پێت دەکرێت هەوڵ بدە لە کاتە تاڵ و شیرینەکاندا لە خوای گەورە دوور نەکەویتەوە.

- کوڕی خۆم؛ هەوڵ بدە هەمیشە خاکەرا و پشوودرێژ و خۆشکێن بیت، ئەوسا دەبینیت دوعاکانت هەورەکان شەق دەکەن و، دەگەیت بە عەرشی ئیلاهی و، هەموو دوعاکانت دێنە دی. ئەوەش بزانە! ئەگەر یارمەتیی هەژاران بدەیت و ڕێزیان لێ بگریت، وات لێ دێت لە هەموو کێشەکاندا ڕزگارت دەبێت. ورياش بە ئەو شتەی دەیبەخشیت لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بێت. هەوڵ بدە لە دنیادا بژیت و لێنەگەڕێیت دنیا ڕۆبچێتە ناو دڵتەوە و، دڵ بە دنیای فانی مەبەستە و، هەوڵ بدە کونترۆڵی بکەیت و، لە هەر ڕەنجێک کە ئازارت دەدات فێری وانەیەک ببیت و کامڵ ببیت.

- کوڕی خۆم؛ ڕووم له هەر شوێنێک کرد و توێژینەوەم لەسەر هەر خەڵکێک کرد، خەڵک هەموویان لێم دەپرسن بۆچی چاکەکاران ئازار دەچێژن؟ هەروەها بۆچی پتر له خەڵکی ئاسایی کێشە بۆ ئەوان دروست دەبێت؟ ئەوان دەڵێن ئێمە ڕاستگۆ و چاکەکار بووین و، بە هەموو هێز و توانامانەوە هەوڵ و کۆششمان داوە و، ئازارمان بۆ کەس نەبووە و، خراپەمان بۆ کەس نەبووە و، بە پێی توانای خۆمان و تا ئەو ڕادەیەی توانیومانە هەولمان داوە باش بین، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش هێشتا هەر ئازار دەچێژین. بۆچی ئاوهایە؟ کوڕم؛ له ڕاستیدا ئەو کەسانەی چاکەکارن و بەردەوام زیکری خوای گەورە دەکەن هەرگیز ئازار ناچێژن، بەڵکو ئەو ڕەنج و ئازارانەی تووشی کەسانی چاک دەبێت تاقیکردنەوەی خوای گەورەیە، خوای گەورە دەیەوێت له ڕێگای تاقیکردنەوە جیاجیاکانیەوە فێریان بکات له کاتی کێشە و کارەساتەکاندا پشوودرێژ و بەهێز بن، تاکو له ڕێگای ئەم تاقیکردنەوانەوە گەورەیی پلە و پایەی خۆیان بۆ دەربکەوێت، ئەگەر هات و کەسێکی چاکەکار تووشی ئازار یان کارەساتێک یان ڕووداوێک هات، لەبەر ئەوەیە کە لە ڕاستیدا لە شوێنێک لە قووڵایی ناخیەوە لاوازییەک هەیە کە دەبێت لە ڕێگای ئازارەکانیەوە پاک و خاوێن و ڕووناک و تایبەت و بەهێز ببێتەوە.

مرۆڤی چاکەکار تووشی ڕەنج دەبێت تاکو لە ڕێگای ئەو ئازارانەوە ئەو بەشەی وجوودی کە لاواز و ناخالسە پاک ببێتەوە و ببێت بە چاکە و هێز و مەزنی. بەڵام سستی و لاوازی و بێهێزی چۆن دەبێت بە چاکە و هێز و گەورەیی؟ کوڕم وریا بە! وەک چۆن ئاڵتوون لە کوورەدا دەتوێتەوە و قاڵ دەبێتەوە تاکو پاک و زوڵاڵ ببێتەوە، هەر بەمجۆرەش ئەگەر نەختێک خەوش و لاوازی لە وجوودی مرۆڤی چاکەکاردا هەبێت دەبێت بە ئاگری ڕەنج و کێشەکاندا تێپەڕێت، تاکو عیشق و سۆز و نووری خودا بچێتە ناخیەوە و بیکات بە مرۆڤێکی گەورە و مەزن. ڕووناکی و میهرەبانیی خودا لە هەموو شوێن و

هەمـوو کاتێکـدا هەیە، بەڵام ژمـارەیەکی کەم لە مرۆڤەکـان توانـای تێگەیشتن و وەرگرتنیان هەیە. ئەزموونەکان، ئازارەکان و ڕەنجەکان تووشی مرۆڤی چاکەکار دەبن؛ تاکو بتوانن بگەن بەو ئاستەی هەست بە چـاکە و بەخشـندەیی خـودای گەورە بـکەن. ڕەنـج و کێشـەکان بەرەکەتن کە خوای گەورە بۆ گەیشتنی مرۆڤە چاکەکان بە ئاستێکی بـاڵا دەینێرێـت بۆیـان، تـاکو لە مانـای گەورەیـی نیعمەتەکـانی خـودا تێبگەن. کوڕەکەم خودا دنیایەکی سەرسووڕهێنەری ئافراندووە، خوا دەیەوێت هەموو مرۆڤەکان دڵخۆش و بەختەوەر و سـەربەرز بن و، چێژ لە هەمـوو باشـی و جوانییەکـان ببینن، بەڵام بەر لە وەرگرتنیـان دەبێت بە تەواوی ئامادە بن. کەواتە کوڕی خۆم ئەوە بزانە کە لە هەر ڕەنــج و کێشــەیەکدا، وانەیەک حەشــاردراوە کە بە فێربــوونی ئەو وانەیە، ئەو ڕەنج و ئازار و کێشەیە فەرامۆش دەکرێت. "بۆ نموونە بۆ بەدەستهێنانی گەوهەر دەبێت بچیتە قووڵایی دەریاوە."

- کوڕی شیرینم ئاگادار بە! خوای گەورە کەسانێکی خۆش دەوێت کە بە بڕوایەکی بێخەوش و تامەزرۆیانەوە لە ناخی خۆیاندا بەردەوام لە یادی چاکەکاری و زیکری خودا و بیرکردنەوە لە ئافرێنراوەکانی خـودان و، تـا ئەو شـوێنەی پێیـان بکرێت، توانـا و سـامانی خۆیـان لە ڕێگای ڕەزامەندیی خوای گەورە دەخەنەگەڕ و، لە ڕێگای بیرکردنەوە لە کـردەوەی چـاک و وتـاری چـاک، تـامەزرۆیی بەرامـبەر بە خـوای گەورە لە نـاخی خۆیانـدا دروسـت دەکەن و، لە ڕاسـتیی پەیوەسـت بـوون بە خــوای گەورە تێــدەگەن. کــوڕەکەم؛ ئەو کەســانەی ئەم تایبەتمەندییانەیان تێدایە دەگەن بە باڵاترین هێزی ژیان و گەورەترین ئارامی.

- کـوڕم وریـا بە! ئەو کەسـانەی گەیشـتوونەتە پلەیەکـی بـاش لە تاقانەیی خودا؛ سێ نیشانەیان هەیە: یەکەمیان ئەوەیە کە خۆشکێن و خاکەرا و پشوودرێژن، دووەمیشیان ئەوەیە پەیوەست نین بە دنیا و چێـژە دنیاییەکـان و، سێهەمیشـیان ئەوەیە کە بە زیکـری خـودا و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خودا و چاکەکاری سـەرقاڵن و، ئەو کاتەیە کە ئیتـر ڕۆحـی خـودای گەورە لە ڕۆح و جەستەیاندا بوونی هەیە و، بەردەوام سوود لە نووری خـودا دەبینن و، بەردەوام لە ئارامیدان و، باشـترین کاتەکانیـان ئەو کاتـانەیە کە لە ڕۆح و جەسـتەی خۆیانـدا هەست بە نووری خودا دەکەن و، هەوڵ دەدەن نوور و ئارامیی خودا بگوازنەوە بۆ خەڵکیش.

- کـوڕەکەم؛ هەوڵ بـدە لە هەمـوو کاتەکـانی ژیانتـدا پەیـژەیەک لە زیکری خـودا و ئـارامی و بێدەنگی و بیرکـردنەوە لە خـودا دروسـت بکەیت و، لە هەموو کارەکانتدا بیربکەرەوە و پشوودرێژ بیت، تاکو لە ڕێگـای ئەو پەیـژەیەوە لە پـێش چـاوی خـودای گەورە بگەیـت بە لووتکەی ئـارامی و گەورەیی. ئەوەش بزانە خـودا دۆست و هـاوڕێی ئەو کەسـانەیە کە تامەزرۆییـانە دڵ و هـزر و بیـر و توانـایی و تـا ئەو ڕادەیەی لە دەستیان بێت لە دارایی و سامانی خۆیان لە ڕێگای خـودا خەرج دەکەن، ئەو کەسـانەش کەسـانێکن کە لێـوڕێژ بـوون لە گەورەترین سۆزی خوای گەورە و، بەردەوام لە ئاسوودەییدان.

- کوڕی ئازیزم؛ ئەوە بزانە کە ڕێگای خودا و فەرمانی خودا جوانترین و مەزنترین حاڵەتی ئارامی و عیشق بە خودای گەورەیە و، بە ڕاستی گوتنی زیکری خودا قووڵترین و باشترین ڕێنوێنیی ژیانە. بیرکردنەوە لە خودا و گوتنی زیکری خودا باڵاترین ئیلهامبەخش و ڕێگای جیاجیا بۆ ڕزگاربوون لە کێشەکان بۆ کەسانی جیاجیا و بە تایبەتمەندیی دەروونیی جیاجیا بە گوتنی زیکری خودا باڵاترین و گرنگترین هەنگاوەکانە بۆ گەیشتن بە خودا و، ڕزگاربوون لە گوناهەکان و نوورانیبوونی مرۆڤەکان.

- کوڕی خۆم ئاگادار بە! کەس ناتوانێت لە ڕێگای گوتنی زیکری خودا ڕێگای گەیشتن بە ئارامی و چێژبینین پێشکەشی تۆ بکات. دەبێت تۆ خۆت بگەیت بەم ئارامی و چێژە، کەواتە هەوڵ بدە هەموو ڕۆژێک پڕۆڤە بکەیت بۆ ئەوەی بگەیت بە ئارامی، هەڵبەت بەو مەرجەی زیکری خودای گەورە بکەیت. هەروەها کوڕی خەم کاتێ هەستت بە تەنیایی کرد و خۆتت تەنیا و غەریب زانی؛ ئەوسا ئیتر کاتی تێداچوونی تۆیە و هەوڵ بدە هەمیشە لەوە دڵنیابیت لەگەڵ هێزێکی مەزندا لە پەیوەندیدایت و، ئەو کاتەیە کە هێز و توانایەکی زۆر گەورە بەدەستدەهێنیت و، بە تێگەیشتن لە هەبوونی وەها هێزێک لە ژیانتدا دەکەویتە ناو ئارامییەوە.

- کورەکەم؛ تەنیا لە ڕێگای بێدەنگی و گوتنی زیکری خوداوە دەتوانیت لە بێدەنگیدا فێر ببیت، تاکو لە ڕێگای ئەوەوە ناخت بە زمانی دڵ لەگەڵتدا قسە بکات. کەواتە ئەگەر بێدەنگ بیت و بیر لە ئایەتەکانی خودا بکەیتەوە و، زیکری خودا بڵێیتەوە لە ڕێگای نوور و ئیلهامەوە ئاگادار دەکرێیتەوە و، ئەوسا ئیتر ڕۆحت دەگات بە ئاستێکی بالا و لە هەموو پلەکانی ژیانتدا یارمەتیت دەدات و، بەردەوام ئاگادارت دەکاتەوە کە کامە ڕێگا ڕاست و دروستە و، کامە ڕێگا هەڵەیە، چونکە ڕۆحت گەیشتووەتە ئاستێکی بالا و لە دنیای نووری خوداوە ڕێنوێنی دەکرێت.

- کوڕی شیرینم؛ مێشک و هزری تۆ ئەندامەکانی ڕۆحی تۆن و، تەنیا لە بێدەنگیدا و بە گوتنی زیکری خودا بیر و هزری تۆ نوورانی و ڕووناک دەبێتەوە و، بیر و هزری ڕووناک و نوورانی بە پاکیی خۆیان دەتوانن لە دنیای پاکژی خودای گەورەوە هێز وەربگرن، ئەو کاتەی بیر و هزرت پەیوەست بوو بە دنیای بێگەردەوە ئیتر تۆ هەمیشە لە نووری خودا فەرمان وەردەگریت و، هیچ کاتێک گومڕا نابیت و، تا کۆتایی ژیانت لە شادی و ئارامیدایت و، بە عەقڵێکی نوورانی لە هەموو کارەکانتدا سەرکەوتوو دەبیت و دەکەویتە ناو ئارامییەوە.

- کوڕەکەم ئاگاداربە! هەمیشە ئامۆژگاریت دەکەم بە زیکری خودا و، بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی، ئەمە باڵاترین و باشترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە خودای گەورە. هەروەها بیرکردنەوە لە ئافرێنراوەکانی خودا خۆی زیکرێکی زۆر گەورەیە و، ئەمە ڕێگای کەسانێکە کە جگە لە خودا پشت بە کەسی تر نابەستن و، جگە لە خوا داوا لە کەسی تر ناکەن و، هەر ئەمانەشن دەکەونە ژێر سایەی ڕەحمەت و پشتگریی خوای گەورە و، لە ڕێگای زیکری خوداوە لە شەڕی شەیتان ڕزگار بوون.

- کوڕی خۆم ئاگاداربە! بەندە تایبەتەکانی خودا ئەو کەسانەن کە بە ڕاوەستاوی و بە ڕاکشاوی و لەو کاتانەشدا وا لە جووڵەدان لە یادی خودا غافڵ نابن و، لە هەر حاڵەتێکدا سەرقاڵی زیکر و بیرکردنەوە لە ئافرێنراوەکانی خودای گەورەن و، ئەوەش بزانە ئەگەر خواستی خودا لە ڕێگای گوتنی زیکری خودا نەبوایە بە دڵنیاییەوە شەیتان تۆی بەرەو لەناوچوون و بەدبەختی دەبرد، کوڕی خۆم ئەوەش بزانە هەنگاونان لە ڕێگای خودا بێ یارمەتیدان و خواستی خودای گەورە ناکرێت. کەواتە هەمیشە هەرچییەکت دەوێت لە خوای گەورە داوای بکە و، بزانە ئەوە خودایە هەر کەسێکی بوێت لە خەوشەکان پاکی دەکاتەوە.

- کوڕم؛ لە کارەکانتدا پشوودرێژ و خۆڕاگر بە و، بەر لە کردنی هەر کارێک و گوتنی هەر قسەیەک سەرەتا بیر بکەرەوە، ئەوەش بزانە ململانێ لەگەڵ خووە شەیتانییەکان پێویستی بە سەبر و تاقەت هەیە. کەواتە لەو ڕێگایەدا پشت بە خودا ببەستە و، بزانە لەم ڕێگایەدا دەتوانیت بەندە چاکەکانی خودا بناسیت. (دوای بیرکردنەوە و زیکر کە هەموویان دەروونین و تۆ ناتوانیت بیرکردەنەوە و زیکری ئەوان ببینیت، چونکە لە ناو بیر و هزری ئەواندا ڕوودەدات) تۆ تەنیا لە ڕێگای بیرکردنەوە و هاونشینی و ژیان لەگەڵ ئەواندا لە گەورەیی و ئاستی باڵای ئەوان تێدەگەیت. ئەوەش بزانە بەندە تایبەتەکانی خودا هەمیشە لە حاڵی نوێژکردندا بە قووڵبوونەوەیەکی تەواو سەرقاڵی عیبادەتی خودا دەبن و، ئەمانەتدارترینی مرۆڤەکانن و، باوک و دایکیان و شوێنکەوتووە ڕاستەقینەکانی خوایان خۆشدەوێت و، هەمیشە کەم قسە دەکەن و خۆیان لە مشتومڕی بێهوودە بە دوور دەگرن و، لەگەڵ ئەو کەسانەی بە دوای شەڕەقسەوەن شەڕ ناکەن و، کاتێک باس و گفتوگۆ دەکەن بە ئارامی و پشوودرێژی و بە وردییەوە قسە دەکەن و، بە کەمی داوای شتێک دەکەن و، لە هەموو شوێنێکدا خەڵک بەرەو چاکەکاری ڕێنوێنی دەکەن و داوایان لێ دەکەن لە خراپەکاری دوور کەونەوە. هەروەها لەو شوێنانەش کە یادی خودای تێدا ناکرێت و شەیتانیان بەسەردا زاڵە دوور دەکەونەوە. هەروەها بۆ یارمەتیدانی هەژاران ڕەزیل نین. خەرجی بێهوودەش ناکەن، وەها دەبەخشن کە دواتر خۆیان سەرکۆنە نەکەن و، لەگەڵ خەڵک هەڵبکەیت و لە کارە بێهوودەکانی نەزانەکان خۆش دەبن و، هەمیشە بە دوای بەدەستهێنانی ڕزقی حەڵاڵن و، لە بێهوودەییەکان دوور دەکەونەوە و، لەگەڵ دۆستانی خودا میهرەبانن و، دڵە پاکەکانیان لێوڕێژە لە زیکری خودا و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خودا و، لە هەموو دۆخێکدا دڵ و بیر و هزریان سەرقاڵی خودای عالەمیانە.

- کوڕەکەم؛ بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خودا دەتگەیێنێت بە بڕوایەکی تەواو و قۆناغی ئینسانییەت. هەروەها بیرکردنەوە لە ئافراندنی مرۆڤ و بیرکردنەوە لە ئاسمان و زەوی بالاترین عیبادەت بە شوێن خۆیاندا دێنن، ئەوەش بزانە زەوی و ئاسمان هەموویان پەرجووی خودان، بەلام هاتنە دەرەوەی جووجک بە ڕەنگە جیاجیاکان زۆر سەرسووڕهێنەرترە لە دەرهاتنی وشتر لە ناوەڕاستی کێو. کەواتە بە نەختێک بیرکردنەوە، هەموو ئافرێنراوەکانی خودا بە پەرجوو دەزانیت. هەروەها لە ڕێگای بیرکردنەوەوە زووتر دەگەیت بە خوداناسی.

- کوڕم ئاگادار بە! هەموو ئازار و نەخۆشییە جەستەیی و نیگەرانییە ڕۆژانەکان لەبەر نەبوونی ئارامیی ڕۆحە. کەواتە ئەگەر ڕۆحت لە ئارامیدا نەبێت و ناخت تاریک و لێڵ بێت لە ئەنجامدا جەستەیشت هەمیشە نەخۆش و لاواز دەبێت. کوڕم وریا بە! بۆ شیفای جەستە سەرەتا دەبێت ڕۆحت شیفا بدرێت. شیفای ڕۆحیش لە ڕێگای زیکری خودا و چاکەکاری و ڕێنوێنی خەلکەوە دەبێت. ئاگادار بە! مەبەستی ناخ و هزری تۆ، جەوهەری ڕۆحی تۆیە.

- کوڕی خۆم؛ بیرکردنەوە و قوولبوونەوە لە ئایەتەکانی خودا یەکێکە لە گەورەترین و بەشکۆترین حالەتەکانی ڕۆحی مرۆڤ. کەواتە لە ڕێگای بیرکردنەوە لە ئافرێنراوەکانی خوداوە دەتوانیت گەشە بە ڕۆحت بدەیت و، مەبەست و گەورەیی ڕۆح لە بیر و هزردا حەشار دراوە و، دەبێت لە ڕێگای هزرەوە بگاتە ئاستێکی بالا و، ناکرێت بە پێی ڕوالەت بڕیاریان لەسەر بدەیت. کەواتە هەر کاتێک گەیشتیتە ئاستێکی بالا ڕۆح و جەستەت دەبن بە یەکێک و،

جەستەشت هاوشێوەی ڕۆحت نووورانی و پاکژ دەبێت. ئەوسا ئیتر دەتوانین بڵێین جەستە هەمان ڕۆحە.

- کوڕە شیرینەکەم وریا بە! کاتێ تاریکی و تووڕەیی و غەزەب هەموو گیانی داگرتیت جەستە و ڕۆحت تووشی عەزاب دەبێت و، تۆ تەنیا بۆ ساتێکیش ئوقرە و ئارامیت نابێت، ئەگەر بێت و لەو کاتانەدا لەناو بێدەنگیدا زیکری خودای گەورە بکەیت، زیکر و هێنانی ناوی خودا وەک ڕووناکییەک لەناو دڵتدا دادەگیرسێنێت کە وەکو تیشکی خۆر ناخت ڕووناک دەکاتەوە، لەو کاتەدایە کە ئیتر ساتەکان و تێپەڕبوونی کات لە فکر و دڵ و چاوەکانت بە ئارامی تێدەپەڕن. کەواتە هەوڵ بدە لە ڕێگای تووڕەیی و غەزەبەوە ناخی خۆت تاریک نەکەیت.

- کوڕی ئازیزم؛ ئەو کاتانەی تۆ لە ناو بیر و ئەندێشەی خۆتدا هەوڵی ناسینی خودا دەدەیت؛ خوداش بارودۆخێکت بۆ دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بتوانیت باشتر خودا بناسیت. کوڕی خۆم تۆ ناتوانیت لە ڕێگای فەلسەفەوە خودا بناسیت، بەڵام لە ڕێگای بیرکردنەوە لە ئافرێنراوەکانی خوداوە دەتوانیت بگەیت بە تێگەیشتن و بڕوایەکی تەواو و، تێدەگەیت کە خودا وڵامی هەموو پرسیارە ڕۆحییەکانتە. ئەوەش بزانە کە خودا داوای کارێکت لێ ناکات کە لەبەر شانت قورسە و پێت ناکرێت، بەڵام تۆ خۆت دەبێت لە ڕێگای زیکر و ڕێنوێنیکردنی خەڵکەوە خۆت بگەیەنیت بە ئاستێکی باڵا.

- کوڕەکەم؛ بە دڵنیاییەوە و بە ڕاستی خودا هەمیشە لەگەڵ تۆیە و، لەپشت دڵتەوە ڕاوەستاوە و لە دەرگای دڵت دەدات و، ئیزنی داخڵبوونت لێوەردەگرێت، کەواتە ئەوە تۆی دەبێت لە ڕێگای زیکری خودا و چاکەکاری و ڕێنوێنیکردنی خەڵک دەرگای دڵت بکەیتەوە و، ڕێگای بدەیتە ناو دڵ و بیر و هزرتەوە. ئەوسا ئیتر خوداش دێتە ناو دڵ و ناختەوە و سەرڕێژ دەبیت لە هێزێکی مەزن. ئەوسا ئیتر بیر لە ئارەزووە دنیایی و کێشە زۆرەکان ناکەیتەوە و سڵ دەکەیتەوە لە بردنی تاریکی و عەزاب بۆ ناو دڵت.

- کوڕی خۆم وریابە! ماڵ و سامان و چێژە دنیایی و فانییەکان و هێز و ناوبانگ، سامانی ڕاستەقینە و هەتاهەتایی نین، بەڵکو سامانی ڕاستەقینە نوورانیبوونی ڕۆح و گەشەسەندنیەتی؛ کە ئەویش تەنیا لە ڕێگای زیکری خودا و چاکەکارییەوە دەستدەکەوێت. ئەوەش بزانە بۆ گەیشتن بە ئارامی و ئاستی بالای ڕۆح دەبێت لە دنیادا بژین، بەلام هۆگری دنیا نەبین، ئەگەر دەتەوێت بگەیت بە ئاستێکی بالای ڕۆحی، تەنیا لە ڕێگای زیکر و چاکەکارییەوە ڕۆحت نوورانی دەبێت. کاتێ بە هەموو بوونتەوە و لە ناخی خۆتەوە بە دەنگی بەرز زیکری خوای گەورەت کرد؛ ئەوسا ئیتر ڕۆحت نوورانی دەبێتەوە.

- کورەکەم وریا بە! قسە بەنرخەکانت لە دەرمان دەچن و دەرمانیش ئەگەر بە ڕێژەیەکی کەم بەکاربێت بەسوودە، دەنا زۆری کوشندە و ژاراوییە، کەواتە هەوڵ بدە کەم بدوێیت، بەڵام بە وردی و بە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە قسە بکەیت، ئەگەر نەتتوانی قسەی بەنرخ بکەیت باشترە بێدەنگ بیت و قسەی بێهوودە نەکەیت. کەواتە لە بێدەنگیدایە کە خودا ئەندێشەی مرۆڤ نوورانی دەکات و، قسەی زۆر بەنرخ و بەبایەخ دەنێرێت بۆ هزرت و ئەوسا دەتوانیت قسەی بەسوود بە خەڵک بڵێیت و لە ڕێگای قسە بەنرخەکانتەوە دەبیت بە کەسێکی بەنرخ و مەزن.

- کوڕی خۆم؛ هەوڵ بدە هەمیشە وەها خۆت پەروەردە بکەیت کە هیچ کاتێک نیگەرانی سبەی نەبیت و، لەوەش دڵنیابە ئەو خودایەی بە درێژایی ژیانت ئاگای لە تۆ بووە و ڕزق و ڕۆزی پێ بەخشیویت؛ سبەی ڕۆژیش ئاگای لێت دەبێت و ڕزق و ڕۆزیت پێ دەبەخشێت. ئەو خودایەی وا تاقانەی نەگۆڕە، ئەو خودایەی دوێنێش وەکو ئەمڕۆ و سەدان سەدە و هەمیشە و هەمیشە هەر هەیە و هەر دەبێت؛ هەمیشە لەگەڵ تۆدایە و هەمیشە ڕێنوێنیت دەکات. کوڕی خۆم ئەگەر تۆ بەردەوام زیکری خودای گەورە بکەیت و، لە هێزی خودا دڵنیا بوویتەوە؛ ئەوسا ئیتر ترسەکانت لە داهاتوو لەناو دەچن.

- کورِم بزانە! لە بێدەنگیدایە کە مرۆڤ بیر دەکاتەوە و لە سەرچاوەی تاریکیی ڕۆح و گیانی تێدەگات، هەروەها هۆکاری تاریکی و بێ ئۆقرەیی و عەزابە ڕۆحییەکانی چی بووە. هەر لەو کاتەشدایە کە تێدەگات چارەسەری هەموو ئازار و ئەشکەنجە ڕۆحی و جەستەییەکانی زیکری خودای گەورەیە کە خێراترین و سادەترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە ئارامی و چێژی ڕۆحی. هەر کاتێکیش ڕۆح گەیشتە ئارامی نەخۆشییەکانی جەستەشی چارەسەر دەبن.

- کورِم؛ ئەگەر دەتەوێت هەست بە چێژی زیکری خودا و ئارامیی ڕۆح و چێژ و دڵخۆشیی تێگەیشتن لە قووڵایی ناخی خۆت بکەیت؛ دەبێت هەوڵبدەیت سەرەتا بێدەنگی ئەزموون بکەیت و لە ڕێگای بێدەنگییەوەیە کە دەتوانیت لە قووڵایی ناخی خۆت بگەیت بە لوتف و ئارامیی ڕۆح و، دەبێت ئاگادار بیت خۆت دوور بگریت لە ڕەخنەگرتنی خەڵک و، ئەگەر ڕەخنە لە خەڵک بگریت هیچکات ناگەیت بە ئارامی ڕۆح و، هەرگیز ئارامیی ڕاستەقینە ئەزموون ناکەیت. هەروەها هەوڵ بدە لە هەموو کاتەکانی خۆشی و چێژ و دۆڕان و سەرکەوتن و، لە کاتی چێژ و لە بەر هەتاودا و لەژێر باراندا دڵت بە لای خوداوە بێت؛ ئەوسا ئیتر هەست بە چێژی زیکری خودای گەورە دەکەیت.

- کوڕی خۆشەویستم ئاگاداربە! بە دوای چێژە دنیاییەکاندا مەچۆ، چونکە چێژە دنیاییەکان تووشی نەخۆشیت دەکەن. مەکەوە شوێن ماڵ و سامانی زۆر، چونکە دەتکات بە بەندەی خۆی و، هەوڵ بدە بە دوای دەسەڵاتدا نەڕۆیت، چونکە دەسەڵات دەتفەوتێنێت و تەنیا هەوڵ بدە ئەم چەند ڕۆژەی ژیانی دنیای فانییە فێری ڕێگای چۆنیەتی گەیشتن بە ئارامیی ڕۆح و جەستە ببیت؛ کە ئەویش تەنیا لە ڕێگای گوتنی زیکری خوا و بیرکردنەوە لە هێز و ئافرێنراوەکانی خودا و چاکەکاری و، ئەگەر بتوانی ڕێنوێنی خەڵکەوەیە و، ئەمەش دەبێت بە هۆی پاشەکەوتکردنی بالاترین گەنجەکان بۆ تۆ لە ئاسماندا.

- کوڕم؛ هەوڵ بدە بە درێژایی تەمەنت هەموو کارەکان بە باشترین شێوە و بە تەواوی ئەنجام بدەیت، واتە هەموو کارەکان بە پشت بەستن بە خوای گەورە و بە بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لەبەر چاو گرتنی هەموو لایەنەکان ئەنجام بدەیت، پاشان ئەنجامی کارەکە بسپێریت بە دەستی خودای گەورە. واتە سەبارەت بەوە ئەگەر هەر ڕووداوێک ڕوو بدات بزانە حیکمەتێکی تێدا بووە و، حیکمەت دارێکە بنچی لە دڵ (بیر و ئەندێشە)یە و، میوەی لە سەر زاردایە. واتە بە بیر و ئەندێشەوە قسە بکە، تاکو لە کاتی قسەکردندا باشترین میوە و سەمەرەکان هەڵبگریتەوە.

- کورم وریا به! ئەدەب و مەعریفە هیچ خەرجییەکی نییە، بەڵام دەتوانیت هەموو باشییەکانی پێ بکڕیت. تۆ دەتوانیت بە کاری چاک و گوتنی قسەی چاک سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆت ڕابکێشیت و، وایان لێ بکەیت خۆشیان بوێیت و، لە ڕێگای گوتنی ڕاستییەکانەوە بەرەو لای خودا ڕێنوێنییان بکەیت. بە درێژایی تەمەنت ببیت بە هەر شتێک بەرهەمی بیرکردنەوە و ئەندێشەیەکە کە پێشتر یان ئێستا هەتبووە. تۆ لە ڕێگای بیرکردنەوە و ئەندێشەی دروستەوە دەتوانیت هەم لە پێش چاوی مرۆڤەکان بگەیت بە پلەیەکی باڵا و، هەم لە لای فریشتەکان بژیت، بەڵام بە بیرکردنەوە و کردەوەی نەشیاو هەردوو دنیات دەفەوتێنیت.

- کوڕی خۆم؛ ئەوە بزانە گەورەیی و ڕێزی تۆ لە پێش چاوی خەڵک لەوەدایە کە تۆ پێویستت بە کەس نەبێت، بەڵام خودا ئەو کەسەیە کە هەموو پێویستییەکانت بۆ دابین دەکات، کەواتە تۆش پێویستییەکانت لە خوا داوا بکە. سامانی ڕاستەقینە میهرەبانبوونە لەگەڵ خەڵک و، ڕێنوێنیکردنیانە بەرەو لای خودا و چاکەکاری. هەروەها ساکارترین و جوانترین وانەی ژیان ئەوەیە کە هەرگیز هیچ بوونەوەرێک ئازار نەدەیت و، هەوڵ بدە لەگەڵ هەموو بوونەوەرێکدا بە باشی و میهرەبانی مامەڵە بکەیت، ئەوەش بزانە گەورەترین و بەبایەخترین گەوهەرەکان دڵێکی لێوانلێوە لە زیکری خودا و بیرکردنەوە لە چاکەکاری و خزمەت بە خەڵقی خودایە و ئەو دڵەی لێوانلێو لە زیکری خودا هەمیشە لە ئارامیدایە.

- کورِم؛ تۆ دەبێت بۆ گەیشتن بە پلەیەکی باڵا و نوورانیبوون لە کەموکورِییەکانی خۆت ورد ببیتەوە و، ئازایانە و بە دڵێکی گەورەوە لە کەموکورِییەکانی خۆت تێبگەیت. ئەوەش بزانە زانینی کەموکورِی بچووکی نییە، بەڵکو هێزێکی گەورەیە و، زانینی عەیبەکان ئاسان نییە مەگەر ئەوەی تۆ داوا لە خوای گەورە بکەیت پاکژت بکاتەوە و کارەکانت بۆ ئاسان بکات. کورِم بروای تەواو دوو بەشە؛ بەشێکی سەبر و بیرکردنەوە لە کارەکانە و، ئەوەکەی تریشی عیبادەت و زیکری خودایە.

- کورِی شیرینم؛ ڕێکوپێکی و وردبوونەوە لە کارەکان گەورەترین یاسایە و، هەر لەبەر ئەوەشە خوا هێندە بە ڕێکوپێکی سروشتی ئافراندووە. ئەوەش بزانە جوانیی مرۆڤ بە قسە و کردەوەیەتی، کەواتە تا پێت دەکرێت هەوڵ بدە قسە و کردەوەت ڕێکوپێک و دروست بێت، تاکو لە دنیای دوای مردن هەموو جوانییەکانت بە نەسیب بێت و، هەوڵ بدە لە هەموو کارە ڕۆژانەکان و بە درێژایی ڕۆژ و، لە هەموو گەشتەکان و هەموو هاوبەشیکردنەکاندا هاورِێ و دۆستت چاکەکار و لەخواترس بێت، ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەوە بێت خۆت بۆ لەناوچوون و سزا ئامادە بکە.

- کورم؛ هەوڵ بدە لە هەموو کارەکانتدا هاوڕێیانێک هەڵبژێریت کە چاکەکار و لە خواترس بن، چونکە هاوڕێی باش دیارییەکی گەورەیە کە لە هەمـوو کارەکانتـدا یارمەتیـت دەدات، هاوڕێیانێـک کە تەنیـا چاویـان بڕیـوەتە سـامانەکەت لەگەڵ یەکەم دۆڕانـت بەجێتـدەهێڵن. هەروەهـا هەوڵ بدە لە کارەکانتدا نائومید و دڵشکاو نەبیت، چـونکە خـودا لەگەڵ تۆدایە و باشـترین پـلان بـۆ کارەکـانی داهاتووت کەڵـک وەرگرتن و ئەزموون وەرگرتنە لە ئێستا و، ئەوەش بزانە زیانبارترین عەیـب و کێشـەکان نەبینینـی کەموکوڕییەکـانی خـۆتە؛ کەواتە هەمـوو شـەوێک بەو کـارانەدا بچـۆرەوە کە بە درێژایـی ڕۆژەکەت ئەنجامـت داون.

- کـوڕی ئـازیزم؛ دڵنیـابە ئەو کەسـانەی لەبەر ڕەزای خـودا بە دڵگەرمـی و چێژەوە یـارمەتیی هەژاران دەدەن و دەسـت و دڵکـراوەن زۆر دەوڵەمەند و گەورە دەبنەوە، بەڵام ئەو کەسانەی زیاتر سەرقاڵی کـۆکردنەوەی سـامانن و هەوڵ نـادەن لەبەر ڕەزای خـودا فلسـێک لە سامانەکەیان خەرج بکەن؛ لە کۆتاییدا بە هەژاری و بەدبەختی دەمـرن و، منداڵەکانیان موڵک و سـامانەکەیان لە ڕێگا شـەیتانییەکانەوە خەرج دەکەن و، خۆیـان هـیچ سـوودێکی لـێ نـابینین نە لەم دنیـا و نە لە قیامەتیشدا و، تەنیا خزمەتکاری و حەنباڵییەکەیان بۆ ماوەتەوە.

- کوڕی خۆم؛ هەر کەسێک دەست و دڵکراوە بێت و، موڵک سامانی خۆی لە ڕێگای ڕەزامەندی خوای گەورە خەرج بکات؛ لە ئاکامدا هەم تینوویەتی خۆی دەشکێنێت و، هەم تینوویەتی خەڵکیش، کەسێک کە دەست بە ماڵی خۆیەوە بگرێت و بەخشش نەکات دواجار تێدا دەچێت، هەر کەسێک پشت بە خودا ببەستێت وەکو داری سەوز هەمیشە سەوز و زیندوو دەمێنێت. بەهرەی کاری خواناسان چێژبەخشە و هەموو ئەو کەسانەی خەڵک بەرەو ڕێگای ڕزگاری ڕێنوێنی دەکەن، بە ئارامییەکی گەورە دەگەن. ئەگەر لە بیری بەدەستهێنانی چاکە بیت دەبیت بە خۆشەویستی خوای گەورە و، ئەگەر بکەویتە شوێن خراپە جگە لە خراپە هیچت بە نەسیب نابێت و، دواجار تێدا دەچیت.

- کوڕم؛ ئەوەش بزانە کەسی چاکەکار هەرگیز تووشی بەڵا و خراپە نابێت. سامانی کەسی چاکەکار پڕبەهرەترین سامانە و، ژیانی کەسی چاکەکار وەکو چرایەکی ڕووناک شەوق دەداتەوە، بەڵام ژیانی گوناهکارەکان و ئەو کەسانەی سامانی خۆیان لە ڕێگای حەرامەوە کۆکردووەتەوە وەکو چرایەکە کە بەرەو کز بوون دەچێت و، زۆر زوو دەکوژێتەوە و لەناو دەچێت. هەژاری و ڕسوایی تووشی کەسێک دەبێت لە ڕێگای حەرامەوە سامانی کۆکردبێتەوە و، دواجار تووشی عەزابی ڕۆحی و جەستەیی دەبێت و، خۆی و ئەو کەسانەی کەڵکیان لە سامانەکەی وەرگرتووە لەناو دەچن.

- کوڕی شیرینم؛ ئەوە بزانە کە ڕێگای ئارامیی زەین گەورەترین ڕێگای ڕزگاربوونە لە هەموو داڵغەکان و، باشترین گەنجینەی ژیانە. هەر بۆیە ئارامیی ڕۆح و زەین بەبایەخترین سامانەکانە. کەس ناتوانێت وەها ئارامییەک بە پارە و پلەی دنیایی بکڕێت. کەسیش ناتوانێت وەها ئارامییەک تێک بدات و، ژیانی مرۆڤەکان لە ژێر کاریگەری کار و کاردانەوەدایە و هەرچییەک بچێنیت هەر هەمان شت، یان باشتر لەوە هەڵدەگریتەوە. هەر شتێک وەربگریت سەمەرەی کارەکانی ڕابردووتە. کەس ناتوانێت فێڵ لە یاساکانی سروشت بکات. کەواتە هەوڵ بدە چاکەکار بیت و گەورەیی بنوێنیت؛ تاکو چاکە و گەورەییت بەرامبەر بکرێت.

- کوڕم وریا بە! توانایی گەورە و بێسنوور لە ناخی هەموو مرۆڤەکاندایە و، ڕێگای گەیشتن بەو هێزانە زیکری بەردەوام و ناوی پیرۆزی خودایە و، تۆ هەوڵ بدە شەو و ڕۆژ، لە بێداری یان خەو، لە ماڵەوە یان لە بیابان، بە بێدەنگی یان لە کاتی ئەنجامدانی کاری ڕۆژانەکانت بەردەوام ناوی خودا بهێنیت و، بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە ناوی خودا دووبارە بکەیتەوە و، بزانە دوای هێنانی ناوی خوا هزری لێوانلێو لە داڵغەت ئارام دەبێتەوە و، پڕ دەبێت لە ئارامی و شادییەک کە وەسف ناکرێت، بە شێوەیەک کە بە سەختی دەتوانیت لەو ئارامی و بێدەنگییە دەربچیت.

- كورم؛ ڕەنجبردن بەشێکە لە ژیان و وانەت فێر دەکات، ئەگەر ڕەنجت بە نەسیب نەبێت ناتوانیت فێری باشترین وانەکانی ژیان بیت، بەڵام مخابن زۆربەی مرۆڤەکان لەم ڕاستییە تێ ناگەن و، هەموو هەوڵێکی خۆیان دەخەنە گەڕ تاکو لە ئەزموونە بە ڕووالّەت بە ئازارەکانی ژیان دوور بکەونەوە. دوورکەوتنەوە لە کێشەکان بێهوودەیە. خۆبەدەستەوەدان لە بەرامبەر کێشەکانیش نەزانییەکی گەورەیە. کەواتە باشتر وایە فێرببیت هەر کام لە کێشەکان بە هاوڕێیەکی خۆتان بزانن؛ کە پەیام و وانەیەکی گرنگی پێیە بۆتان و، لەم ڕوانگەیەوە بچنە پێشوازی کێشەکانەوە، چونکە هەر کام لەو کێشانە وانەیەکی گەورەی پێیە بۆتان و، خودا لە ڕێگای ئەو کێشانەوە دەیەوێت واتان لێ بکات پێبگەن و کامڵ بن.

- کوڕی خۆم؛ ئەوە بزانە کە تەنیا لە ڕێگای زیکری خودای گەورە و چاکەکارییەوەیە کە دەتوانیت لە خودا نزیک ببیتەوە، ئەوسا خوداش دێتە ناو هزرتەوە و ڕێنوێنیت دەکات. کوڕم تۆ موحتاجی خودایت. وەک چۆن ڕووەک و بوونەوەرەکانی تر پێویستیان بە ئاو و هەوایە. دوعا و زیکری خوداش بەهێزترین وزەکانن کە مرۆڤەکان دەتوانن لە ڕۆحی خۆیاندا دروستیان بکەن. کوڕم؛ هێزی دوعاکردن و زیکری خودا وەکو هێزی ڕاکێشان و هێزی با ڕاستەقینەن.

- کوڕەکەم؛ گەورەترین سەرچاوەی ژیان بڕوا و ئیمان بە دنیای ئەبەدییە و، گەورەترین سەرچاوەی دنیا دوعا و زیکرکردنی خوایە، کەواتە لە بیر و هزری خۆتدا ناوی خودا بهێنە ڕێک وەکو عاشقێک کە بانگی مەعشووقەکەی دەکات و، وەکو هەژارێک کە لە هەوڵی کار و کۆششدایە و، وەکو کەسێک کە خەریکە نوقمی دەریا دەبێت و پێویستی بە تۆسقاڵێک هەوایە. هەروەها کوڕم لە ناو دوعاکانتدا هەموو باری سەرشانت و خەم و نیگەرانییەکانت بسپێرە بە خوا و، دڵنیابە خودا بارە قورسەکان لەسەر شانت لا دەبات.

- کوڕم؛ تۆ لە کاتی دوعا و گوتنی زیکری خودا و، لە هەموو کاتەکانی ژیانت کێشەکانت بسپێرە دەستی خودای گەورە و لە هەموو کاتەکانی شەو و ڕۆژ ئەو کاتەی لە بێدەنگیدایت و بیر و ئەندێشەت لای خودای گەورەوە بێت لەو کاتەدایە کە هزری نائارام و پڕ لە داڵغەت نوقمی نوور و عیشقی خودا دەبێت و ئارام دەگرێت و/ پەیوەندیت لەگەڵ خودا کە سەرچاوەی تەندروستی و ئارامییە و/ سەرچاوەی هێز و دڵخۆشی و هاوسەنگی و جوانی و ژیری و ئەندێشە و ئارامییە دروست دەبێت و/ تۆ دەکەویتە ناو ئارامییەکی چێژبەخشەوە.

- کوڕەکەم؛ خودا چارەسەری هەموو کێشە و گرفتەکانە. ئەگەر هات و تۆ لە بیابانێکی وشک یان لە شاخەکاندا سەرگەردان بیت، ئەگەر خودات لەبیر بێت دڵنیابە هەرگیز تووشی شکست نابیت. هەروەها کوڕی خۆم ئەوەش بزانە باشترین کات بۆ دوعاکردن ئەو کاتانەیە کە بە بیرکردنەوە و قووڵییەکی تەواو داواکارییەکانت بە خودا بڵێیت و، باشترین شوێن دڵتە (بیر و ئەندێشە)، چونکە لە هەموو شوێنێک دەتوانیت لە ڕێگای دڵتەوە بانگی خودای گەورە بکەیت و عیبادەتی بکەیت.

- کوڕی خۆم؛ هەمیشە هەوڵ بدە بە وردییەوە قسە بکەیت، چونکە وشەکانی تۆ دەتوانن وەکو تێغ بەرامبەرەکەت بریندار بکەن، دەشتوانن مەرهەم بن، دەتوانن ببن بە هۆی بێئوقرەیی، دەتوانن ئاسوودەییش ببەخشن. دەتوانن ببن بە هۆی نەخۆشی، دڵێک بشکێن، دەشتوانن شیفابەخشیش بن. وشەیەک دەتوانێت کەسێک بگەیەنێت بە میعراج و، وشەیەک دەتوانێک ژیان تاڵ و بێنرخت بکات. هەوڵ بدە وشەی جوان بڵێیت؛ تاکو دڵێک ئارام بکەیتەوە. هەر بۆیە کوڕی خۆم ئەگەر لە هەموو قۆناغەکانی ژیانتدا بە وردی و بە بیرکردنەوەوە قسە بکەیت دڵنیابە وشەکانت پڕ دەبن لە ئارامی و وزەی بە بایەخ.

- کورِم؛ هەوڵ بدە بەردەوام زیکری خودا بکەیت و، تا پێت دەکرێت کێشەکانت بسپێریت بە خودا و، هەوڵ بدە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانتدا چ لە کاتی کارکردن و، چ لە کاتی نانخواردن و، بە درێژایی تەمەنت لەگەڵ خودا قسە بکەیت و، هەوڵ بدەیت تەنانەت لەو کاتانەی کێشەکانت زۆرن بۆ ساتێک چاوەکانت لێک بنێیت، تاکو دنیا لەپێش چاوت دوور بکەوێتەوە، ئینجا بە هێنانی ناوی خودا دەبینیت خودا لێت نزیک بووەتەوە و، هەرگیز تەنیا نیت.

- زۆرێک لە خەڵک پێیان وایە هێندە خراپ و گوناهکارن کە ناتوانن لە خودا نزیک ببنەوە، بەڵام خودا زۆر بەخشندە و میهرەبانە. تەنانەت میهرەبانترە لە دایک.

- کوڕی ئازیزم وریابە! ئەوانەی بە دوای چێژی دنیای فانییەوەن بە گەیشتن بە هەر کام لەو چێژانەی دنیای خاکی ناگەن بە شادی و ئارامی و، دڵنیابە هەرگیز شادی و ئارامی نابینن، بەڵام ئەو کەسانەی بە دوای زیکر و عیبادەتی خوای گەورە و کردەوەی چاک و ڕێنوێنی خەڵکەوەن بە دڵنیاییەوە دڵخۆشترین مرۆڤەکانن و، بەردەوام لە ئارامی و چێژێکی زۆر گەورەدان کە هەرگیز وەسف ناکرێت و، تەنیا لەڕێگای زیکر و عیبادەتی خوا و چاکەکاری و ڕێنوێنی مرۆڤەکان ئەزموون دەکرێت و دەست دەکەوێت.

- کوڕی ئازیزم؛ تۆ بە درێژایی شەو و ڕۆژ و لە هەموو کاتەکانی ژیانتـدا و، لە هەمـوو کارەکانتـدا بەردەوام گرفتـاری وەسوەسـە و ئەزیەت و ئازاری شەیتان و شوێنکەوتووەکانیت. کاتێک کە بەردەوام سـەرقاڵی زیکـری خـوا بیـت و، بەر لە ئەنجامـدانی هەر کارێـک بیـر بکەیتەوە دڵنیابە شەیتان و شوێنکەوتووەکانی ناتوانن بە سـەرتدا زاڵ ببن و، لەو کاتانەی تۆ سەرقاڵی زیکری خـودا و بیرکردنەوەی خـودا لە بەرزایـی ئەبەدیـیەتەوە فریشـتەکانی دەنێرێـت بـۆ یارمەتیـدان و ڕێنوێنیکردنت و، لە هەوڵ و تێکۆشانەکانت بۆ ململانێ لەگەڵ شەیتان سەرت دەخات و بەهێزت دەکات. کەواتە کوڕی خۆم هەمیشە هەوڵ بـدە زیکـری خـودا بکەیـت و، بەر لە ئەنجامـدانی هەر کارێـک بیـربکەیتەوە، تـاکو لە هەمـوو هەوڵ و تێکۆشـانەکانت دژی شـەیتان سـەربکەویت. هەڵـبەت لە ڕێگـای زیکـری خـودا و بیرکـردنەوە لە ئایەتەکـانی خـودا تـۆ لە هەوڵ و تێکۆشـانێکی گەورەدایـت و، دڵنیـابە تەنیـا نیـت و خـودات لەگەڵە و، تـۆ لەگەڵ کـۆمەڵێکی گەورە لە فریشتەکان لە ململانێیەکی گەورە و شەریفدایت دژی شەیتان.

- کـوڕم؛ دەبێـت تـۆ لە ڕێگـای بیرکـردنەوە لە ئایەتەکـانی خـودا ئافرێنراوەکانی خودا بناسیت و، هەوڵ بدە بە درێژایی ژیانت چاکە و کردەوەی چـاک و زیکری خـودای گەورە بکەیـت بە ڕێگـای خـۆت و، هیدایەت و ڕێنوێنی خەڵـک بە ئەرکی سەرشـانی خـۆت بزانیـت، تـاکو ئینشـاڵلا لەم ڕێگـایەوە بە درێژایـی تەمەنـت لە تەندروسـتی و ئارامیـدا بژیـت و، دوای مـردنیش ڕۆحـت لە خـودا نزیـک بێـت و، هەمیشـە لە خۆشی و شادیدا بێت.

- کوڕی شیرینم وریا به! هەوڵ بده له هەڵبژاردنی هاوڕێ و هاونشین و هاوبەشی کارەکانت و تەنانەت له هەڵبژاردنی هاوسەر زۆر ورد بیت و، هەوڵ بده له کەسێک که له خۆبایی و خۆبەزلزانه و، گوێ له ڕێنوێنی ناگرێت و، تێناگات و نازانێت و ئەوەش نازانێت که ئەزموونی نییه و نازانێت، نزیک نەبیتەوه ئاگاداری خۆت به و هەوڵ بده به درێژایی ژیانت لەو کەسانەی هیچ ئەزموونێکیان نییه و دانی پێدا دەنێن که دەزانن که نازانن نزیک ببەوه و، فێریان بکه و ڕێنوێنییان بکه. کوڕی خۆم ڕێنوێنی ئەو کەسانەش بکه که دەزانن و چاکەکاری دەکەن و، ئاگاداری ئەوەش نین که دەزانن، هەوڵ بده ئاگاداریان بکەیتەوه. هەروەها هەوڵ بده لەگەڵ ئەو کەسانەی دەزانن و به زانیارییەکی تەواو تێدەگەن و له هەموو کارەکانیاندا وردبینن و، خۆیشیان دەزانن ئاگایان له هەموو کارەکانه و، دەزانن که دەزانن چی بکەن و، به باشترین ڕێگا که ڕێگای خوداپەرستی و چاکەکاری و گوتنی زیکری خودایه تێدەپەڕن، ببیت به هاوڕێ و هاونشین و هاوبەش و شوێنی بکەوه و، پرس و ڕای پێ بکه، تاکو له کارەکانتدا سەربکەویت.

- کوڕم وریابه! به درێژایی تەمەنت هۆگری چێژەکانی دنیا نەبیت و، هەرگیز له ڕێگای هۆگربوون به چێژەکانی دنیا خۆت نەکەیته بەنده و کۆیلەی دنیا، چونکه خودا تۆی ئازاد ئافراندووه و، تۆ نابێت بۆ ئەو چەند ڕۆژەی له دنیا دەژیت خۆت بکەیته کۆیله و بەندەی ئەو زەوییه خاکییه و، هەوڵ بده هێنده زیکری خوا بکەیت و هێنده چاکەکار بیت که ڕۆحت گەشه بکات و ئازاد بێت و، بتوانێت دوای مردنیش له ئاسمانەکاندا بفڕێت.

- کورِم؛ هەرگیز جەستەی خۆت ئالوودەی چێژە دنیاییەکان مەکە، چونکە چێژە دنیاییەکان دەبن بە هۆی ئەوەی لە یادی خوا و چاکەکاری غافڵ بیت و، کاتێ جەستەت ئاوێتەی چێژە کاتییەکانی دنیا بوو ئەوسا ئیتر ڕۆحت تاریک دەبێت و، چێژە دنیاییەکان دەبن بە هۆی ئەوە خۆراکی ڕۆحت کە زیکری خودا و چاکەکارییە نەگات بە ڕۆحت و، ڕۆحت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لاواز و بێ تین بێت و، دوای مردن ڕۆحت تاریک و ڕەش و ناشیرین و خەمبار و لاواز و حەیران و سەرگەردان لە زەویدا بمێنێتەوە و، نەتوانێت بەرەو ئاسمان هەڵبکشێت.

- کورِەکەم؛ تۆ لە ڕێگای زیکری خودا و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خودا دەگەیت بە ئاسایش و ئارامییەکی مەزن و، بۆ گەیشتن بە ئارامی پێویستە لەسەرت زیکری خودا بکەیت، بەڵام بۆ گەیشتن بە ئاسوودەیی دەبێت لە هەموو کارەکانی ژیانتدا بە پێی داهاتی ڕۆژانەت ڕێژەیەک پارە پاشەکەوت بکەیت تاکو بۆ سەردەمی پیری و لاوازیت بتوانیت بە ئاسوودەیی بژیت. هەروەها ئەگەر ئێستا لە ئاسوودەیی و دەوڵەمەندیدا دەژیت هەوڵ بدە هەندێک پارە پاشەکەوت بکەیت بۆ کاتی پیریت، چونکە توانایی و هێزی مرۆڤەکان وەکو هەتاوی بەرەبەیان لە تەواوی سەعاتەکانی ڕۆژدا پایەدار نییە.

- کوڕی خۆم؛ بە درێژایی تەمەنت دەکەویتە بەر پەلاماری بێڕەحمانەی شەیتان و شوێنکەوتووەکانی و، شەیتان بەردەوام لە ڕێگای وەسوەسە و شەپۆلی ئاژاوە و توندوتیژی پەلامارت دەدات و، هەندێ جار دەتخاتە ناو دەریایەک لە گومان و دوو دڵی و دەرماندەیی و شکستەوە. کوڕی خۆم؛ لەم کاتانەدا بێدەنگ بە و لە ناو بیر و زەینی خۆتدا بیر لە ئافرێندراوەکانی خودایەک بکەوە کە سەرچاوەی هەموو بوونەوەرەکانە و، لەو کاتەدا لە ڕێگای گوتنی زیکری خودا لە ناختدا هەست بە ڕووناکییەک دەکەیت کە ئەو ڕووناکییە نوورانیت دەکاتەوە و بیرکردنەوەت دەگۆڕێت.

- کوڕم وریابە و ئاگاداربە! کاتێ دەوڵەمەند بوویتەوە ماڵ و سامان نەتکاتە کۆیلەی خۆی؛ چونکە ئەگەر پارە و سامان کردتی بە کۆیلەی خۆی؛ ئەو کاتە ئیتر ستەم لە کەسانی ژێر دەستی خۆت دەکەیت و، هەوڵ بدە پارە و سامان لەخۆباییت نەکات و وات لێ نەکات لە ناخی خۆتدا هەست بە توانایی و دەستەڵات بکەیت، چونکە ئەگەر بێت و هەست بە هێز و دەستەڵات بکەیت سامان وات لێ دەکات هەم دنیا و هەم قیامەتی خۆت بفەوتێنیت. هەروەها کوڕم چەند جوانە ئەگەر تۆ دەوڵەمەند بیت و ئەوەش بزانیت کە سامانی خۆت لە ڕێگای چاکەوە بەکاربهێنیت، تاکو هەم لە پێش چاوی خوا و هەم خەڵکی خوا گەورە بیت.

- کوڕم؛ زیکر و عیبادەتی خودا و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خودا سەرچاوەی عەقڵ و ئەندێشەی مەعنەوی و دنیایی و، دنیایەک لە عیشق و سۆز بەرامبەر بە دنیای دوای مردن و، ئۆقیانووسێک لە خزمەت و فیداکاری بەرامبەر بە خەڵک و ئافرێندراوەکانی خودا لە تۆدا دروست دەکات و، کاتێ گەیشتیت بە وەها قۆناغێک ئەو کاتەیە کە هەم گەیشتوویت بە گەورەترین ئاسوودەیی و، هەم لە پێش چاوی خەڵک دەبیت بە کەسێکی گەورە و بەڕێز و، هەمیشە ڕووبەڕووی ئەو کێشانە نابیتەوە کە خەڵک ڕووبەڕووی دەبنەوە، بەردەوام لە ترسی داهاتوو و مردن و هەزاران داڵغەی تر نابیت کە هەموویان لە لایەن شەیتان و شوێنکەوتوانیەوە دێن.

- کوڕی شیرینم؛ تۆ بە گوتنی زیکری خودا و کردەوەی چاک لێوڕێژ دەبیت لە ئیمانێکی ناوازە و خۆشەویستی و عیشق بەرامبەر بە عالەمی ئەبەدی و، ئارامییەکی هەمیشەیی. هەروەها لە سەرچاوە شاراوەکانی هێزی ناخی خۆت تێدەگەیت و هەستیان پێدەکەیت. هەروەها کوڕی خۆم تۆ زۆربەی کات گرنگی بە بیر و ئەندێشەی خۆت نادەیت، بەڵام ئەگەر بێدەنگ بیت و سەرقاڵی زیکری خودا بیت ئەوسا تێدەگەیت کە بیرکردنەوەت چ توانایەکی هەیە و، هەر ئەم بیرکردنەوانەن دەتوانن ژیانت ڕزگار بکەن، ئەگەر تۆ لە کارەکانتدا بیر نەکەیتەوە ناتوانیت باشترین و سەرکەوتووترین ڕێگا هەڵبژێریت و تێدا دەچیت.

- کورِم؛ هەوڵ بدە لە قۆناغەکانی ژیان و بە درێژایی تەمەنت لە دنیای فانیدا تووڕە نەبیت و، تووڕەبوون لە خۆت دوور بخەرەوە تاکو تەمەنێکی درێژت هەبێت، چونکە تۆ دەتوانیت لە ڕێگای تەمەنێکی پڕ بەرەکەت و درێژترەوە وا لە ژمارەیەکی زۆرتر لە خەڵک بکەیت تاکو لە خوداترس و چاکەکار بن و، سۆز و دۆستییەکی زیاتر لەناو خەڵکدا دەکەیتە باو. کورِم هەوڵ بدە واز لە بڕیاردانی بە پەلە لەسەر خەڵک بهێنیت و، هەوڵ بدە بە وردی و ناسین و بە ئارامی و بەخششەوە ڕووبەڕووی هەموو لایەنەکانی ژیان ببیتەوە.

- کوڕەکەم؛ هەوڵ بدە تەنیا سەبارەت بە کاری چاک و باش باوەڕبەخۆبوونت هەبێت، ئەگەر بەرامبەر بە کاری خراپ باوەڕبەخۆبوونت هەبێت هەرگیز باوەڕبەخۆبوونی ڕاستەقینەت نابێت، چونکە باوەڕبەخۆبوونت بەرامبەر بە کاری ناشیرین لە بایەخی تۆ کەم دەکاتەوە و، لە پێش چاوی خەڵک ئاست نزم و بێنرخ دەبیت. هەمیشە خەڵک بە دوای باوەڕبوخۆبوونەوەن تەنانەت ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خۆیان هەیە لە کەمووکوڕی ئەم تایبەتمەندییە لە خۆیاندا ئازار دەچێژن. (هەروەها کورِم باوەڕبەخۆبوون بە مانای توانای ئەنجامدانی هەموو کارێک و، هەڵبەت دەبێت باوەڕبەخۆبوونی تۆ لەسەر ئەساسی عەقڵ و بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە و ڕاوێژکردن و زانیاری سەبارەت بە هەر چەشنە کارێک بێت).

- کوڕی ئازیزم ئەو شتەی دەبێت بە هۆی ئەوەی تۆ هەم لە دنیا لە ئاســـوودەییدا بیـــت و، هەم دوای مـــردن لە ئارامیـــدا؛ تەنیـــا شوکرانەبژێری خودای گەورەیە کە دەتوانیت لە ڕێگای وتنی زیکر و چاکەکردن بە خەڵک و ئافرێندراوەکانی ئەو کارە بکەیت و، هەرچی زیاتر بتوانیت لە ڕیگای گوتنی زیکری خودا و چاکەکاری نووری ئیلاهی وەربگریت، پتر دەتوانیت هێزی جەستەی خۆت گەشە پێبدەیت و وزەی حەیـاتیی خـۆت زۆر بکەیـت؛ ئەوسـا ڕوانـگەی هـزری تـۆ بەرینتر دەبێتەوە و دەگەیت بە بەختەوەریی دەروونی و، ئەوەش ئەو کاتەیە کە بیرکردنەوەی ناسک و هەستە مەزنەکان زاڵ دەبن بەسـەر مێشک و ڕۆحی تۆ و، دەکەویتە ئاسوودەییەکی ناوازەوە.

- کوڕم؛ بزانە ژیر ئەو کەسـەیە وا لە هەمـوو کارەکانیدا خۆی لە زێدەڕەوی و خەرجی بێهوودە بە دوور دەگرێت و، دەست بە شتەوە دەگرێت کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی داهات. هەروەها هەر کەسێک لە کـار و لە ژیانیـدا میـانەڕەو بێـت و، بـۆ هەمـوو شـتێک هەوڵ بـدات هاوسەنگی ڕابگرێت و، هەموو کارێک بە باشترین شێوە ئەنجام بدات؛ کەســـێکی تەواو و کـــامڵە. هەوڵ بـــدە لە کارەکانتـــدا بـــڕوات بە تواناییەکانی خۆت هەبێت، چونکە هەبوونی بڕوا وات لێدەکات بگەیت بە ئامانجەکانـت. هەروەهـا لە برسـان مـردن باشـترە لەوەی لەگەڵ کەسانی بێ ئیمـان ببیت بە هـاوبەش و، هەوڵ بدە بە درێژایی ژیانت دوور بکەویتەوە لەو کەسانەی لەگەڵ تۆ هاوبیر و ڕا نین و، متمانەت پێیان نییە.

- کوڕی ئازیزم؛ ئەو دیارییانەی بەرامبەر بە شوکرانەبژێری و زیکری خودا و چاکەکاری پێشکەش بە تۆ دەکرێت زۆرن. ئەم دیارییانە ژیانت لێوانلێو دەکەن لە ئارامی و دڵخۆشی و ئاسوودەیی و سەنگینی و گەورەیی و، لەمپەڕێکن بۆ ئەوەی بەر بەو بیرکردنە شەیتانییانە بگرن کە دێنە ناو مێشک و بیرتەوە. چونکە عیبادەت و سوپاس و شوکرانەبژێریی خودای گەورە و، سوپاس و سکاڵا و نیگەرانی و تووڕەیی و دڵەڕاوکێ و سەرگەردانی ناتوانن پێکەوە و لە تەنیشت یەکەوە بن، چونکە سکاڵا و گلەیی و نیگەرانی و تووڕەیی و دڵەڕاوکێ، وەسوەسە و فێڵ و فریوی شەیتانن و، لە ڕێگای بیرکردنەوەی نەرێنی و خراپەوە دروست دەبن. کاتێکیش تۆ سەرقاڵی زیکری خودا دەبیت و دەست دەکەیت بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە هەموو بیرە نەرێنی و خراپ و شەیتانییەکان لێت دوور دەکەونەوە. هەروەها کوڕم هەوڵ بدە لە هەر بارودۆخێکدا پەیژەیەک لە زیکری خودا و چاکەکاری بۆ خۆت دروست بکەیت؛ بۆ ئەوەی کە بتوانیت پێیدا سەربکەویت و بچیتە عالەمی بالاوە و، بگەیت بەوپەڕی ئارامی و ئاسوودەییەوە. کاتێکیش سەرقاڵی شوکرانەبژێریی خوا دەبیت دڵت (بیر و ئەندێشەت) بەرین دەبێتەوە، پێکهاتەی تەندروستی جەستە و ڕۆحت بەهێز دەبێتەوە و پەروەردە دەبێت و، جەستەت بەرامبەر بە نەخۆشییە ڕۆحی و جەستەییەکان پارێزراو دەبێت و، وەکو کوڕێکی پۆلایین دەتپارێزێت.

- کوڕەکەم؛ گەورەیی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بتوانیت بەسەر نەفسی خۆتدا زاڵ و سەرکەوتوو بیت و، ئەگەر کەسێک بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ بێت بە دڵنیاییەوە لە هەموو کارەکانیدا سەرفرازە و، لە دنیای پاش مردنیش ئارامییەکی ڕاستەقینەی دەبێت. هەروەها کوڕی خۆم ئەوەش بزانە ساتێک بچووک و بێنرخ بوونەوە لە پێش چاوی خەڵک باشترە لە هەموو ئەو چێژە کاتییانەی دنیا و کەسێک کە بەر لە کردنی کارێک بیر نەکاتەوە و، پێی وا بێت ژیان بەخت و ئیقباڵە شکست دەخوات.

- کوڕی خۆم؛ ئەوە بزانە کێوە بەرزەکان پڕن لە کانی و داری بەرز. وجوودی مرۆڤە مەزنەکانیش هاوشێوەی کێوە مەزنەکان لێوانلێوە لە لێووردەیی و میهرەبانی و ژیری و ئیمان. لەبەر ئەو عەقڵ و بڕوایەی هەیانە دنیایان پڕ کردووە لە ئاسوودەیی و گەورەیی و دڵخۆشی و، ئاسوودە بوون لە تەنیشت ئەوانەوە هاوشێوەی ئاسوودەبوونە لە تەنیشت باخێکی پڕ لە گوڵ و میوەوە کە تۆ کاتێک دەچیتە ناو باخێکی پڕ لە دار و درەختەوە هەست بە ئارامی دەکەیت.

- کوڕی ئازیزم؛ ئەگەر دەتەوێت هەمیشە بە سەربەرزی و ڕێز و گەورەیی و سەرکەوتووییەوە بژیت؛ دەبێت لە هەرەتی لاویدا کە بە هێز و گەش و بە توانایت بە چاوبڕین لە ئەزموونی خەڵک ژیرانە بژیت، بۆ ئەوەی؛ یەکەم: تەمەنێکی درێژ و بێ داڵغەت هەبێت و، دووەمیش: لە کاتی پیریدا حەسرەتی سەردەمی لاوی نەخۆیت و، ژیان کاتێک جوان و دڵڕفێن دەبێت کە تێیدا هیچ خەم و پەشیمانییەکت بە هۆی کارەکانی ڕابردووەوە نەبێت و، گەنجێتی خۆتت بە چاکەکاری و زیکری خودا و ئەو قسانەی مایەی ڕەزامەندی خودایە بەڕێ کردبێت.

- کوڕەکەم ئاگادار بە! بە درێژایی تەمەنت و لە کاتی گەنجیدا تووشی هەڵە و گوناه نەبیت، چونکە ئەگەر بێت و تێکەڵ بە گوناه ببیت؛ ئەوا ئەو گوناهەی کردووتە لە کاتی پیریدا بەرۆکت دەگرێت و، ئارامی و چێژت لەناو دەبات و، دەتخاتە ناو وەسوەسە و نیگەرانی و دڵەڕاوکێیەوە. هەوڵ بدە وەها خۆت پەروەردە بکەیت کە نەکردنی گوناه بۆ تۆ لە تۆبەکردن چێژبەخشتر بێت و، ئەوەش بزانە کەسانێک کە بەڵێنی خۆیان بەرامبەر بە خودا جێبەجێ دەکەن لە گەورەترین مرۆڤەکانن.

- کوڕم؛ هەوڵ بدە بە درێژایی شەو و ڕۆژ بیر لە هەموو ئەو کارانە بکەیتەوە کە کردووتە؛ تاکو لە ڕێگای بیرکردنەوە لە هەڵەکانی خۆت ئاگادار بیت و، ئەگەر هەڵەکانت ڕاست نەکەیتەوە دەبێتە هۆی ئەوەی دووبارەیان بکەیتەوە و، لە ئەنجامدانی کارەکانی ڕۆژانەت لاواز بیت و، لاوازی و ناتوانایی تۆ دەبێت بە هۆی دۆڕان و فەوتانت لە ژیاندا و، کەسی بەختەوەر و سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە پەند لە ئەزموون و بەسەرهاتی خەڵک وەردەگرێت.

- کوڕی شیرینم؛ ئەگەر لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانت بیر بکەیتەوە؛ ئەوا ئەو بیرکردنەوەیە دەبێت بە هۆی ئەوەی تووڕە نەبیت و، هەر کاتێک تووڕە نەبوویت بیرکردنەوە و تێگەیشتنێکی بالآت دەبێت و، کاتێک کە بیرکردنەوە و تێگەیشتنێکی بالآت هەبوو دەگەیت بە ئارامی و ئاسوودەییەکی گەورە. ئەو کاتە ئیتر ئیرادەیەکی بەرزت دەبێت و، کاتێکیش لە کارەکانتدا ئیرادەی بەرزت هەبوو دڵنیابە بە درێژایی ژیانت سەربەرز و سەرکەوتوو دەبیت.

- کوڕی خۆم؛ توانین و ئەنجامدانی هەر کارێک و سەرکەوتن لە هەر کارێکدا دەبێت لە ڕێگای زانیاری و ئەزموون و ویستەکانی تۆوە بێت. واتە زانین و ئەزموونی تۆ بۆ ئەنجامدانی کارەکان بێ ویستی تۆ هەرگیز ناتوانێت سەرکەوتووت بکات. لە ڕێگای بیرکردنەوە و ئەندێشە و ئیرادەوە لە کارەکانتدا کردنی هیچ کارێک مەحاڵ نییە و بە ئاسانی ئەنجام دەدرێت.

- کوڕم؛ زۆربەی ئەو کەسانەی تووشی بەدبەختی و چارەڕەشی و حەسرەت و مەرگە ناخۆشەکان دەبنەوە ئەو کەسانە بوون کە لەخۆبایی و خۆبەزلزان بوون و، پێیان وابووە پێویستیان بە کەس نییە و، هیچ هۆکارێکیان نییە بۆ ئەوەی شوکرانەبژێریی خوای گەورە بە جێ بهێنن و، پێیان وابووە ئەو سامانەی بەدەستیان هێناوە ئاکامی زانین و تەدبیر و بیری خۆیان بووە و، هەمیشە لە ڕێگای تیجارەت و قازانجی زۆرەوە دەگەیشتن بە ئارامی و، ئەو کاتەش لە پڕ مردن بەرۆکیان دەگرێت پەی بە بێنرخی سامانەکەیان دەبەن.

- کوڕەکەم؛ لە ڕاستیدا ئەو کەسەی بە دوای خودا و ڕاستیدا دەگەڕێت بە هەر هۆکارێک بێت هەم لە کێشەکاندا و هەم بە درێژایی ژیانی شوکرانەبژێریی خوا بەجێدەهێنێت و، دەزانێت هەبوونی مرۆڤ گەورەترین دیاری خودایە، چونکە لە ڕێگای جەستەوە دەتوانێت لە خودا نزیک ببێتەوە و بیناسێت، خودای گەورەش بە کاملترین شێوە هەموو بوونەوەرەکانی ئافراندوو.

- کوڕم؛ تۆ هەر کاتێک گەیشتیت بە ئیمان بە خودا هەرگیز هەست بە تەنیایی و نیگەرانی ناکەیت، ئەوەش بزانە کاتێک لە خەڵوەت و بێدەنگیدا هەستت بە تەنیایی کرد لەبەر ئەوەیە کە هێشتا لە خوای گەورە نزیک نەبوویت و بێ ئەزموون بویت و هەوڵ بدە بەر لە کردنی هەموو کارێک سەرەتا بیر بکەیتەوە پاشان ئەنجامی بدەیت، چونکە ئەنجامدانی هەر کارێک بێ ئەوەی بیری لێ بکەیتەوە وەکو تیر هاویشتنی بێ نیشانەیە کە هیچ نیشانەیەک نییە تاکو بیپێکیت.

- کوڕەکەم؛ ژیان لەدایکبووی بیر و ئەندێشەی تۆیە و، کاتێ تۆ بە باشی بیر نەکەیتەوە دەدۆڕێیت و تێدا دەچیت، کاتێک کە زۆر قسە دەکەیت ناتوانیت بیر بکەیتەوە و، ئەو کاتەش ڕۆحت وەڕەس و ماندوو دەبێت و، پتر لە هەموو شتێ لە بیرکردنەوە بێزاریت، کەواتە هەوڵ بدە کەمتر قسە بکەیت تاکو بتوانیت پتر بیر بکەیتەوە و، بیرکردنەوەی تۆ بە مانای گەیشتنی تۆیە بە ئارامی.

- کوڕی ئازیزم؛ کاتێ لە ڕووی فکرییەوە ئاسوودە و دڵخۆش دەبیت کە زیاتر بیر بکەیتەوە و، ئەو بەهرە زۆرەی خودا لە ناخی تۆدا دایناوە بە کاریبهێنیت؛ کەواتە هەوڵ بدە تێبکۆشیت، چونکە خودا لە سەفەری پڕ مەترسیی ژیان ئاگاداری تۆیە و دەتپارێزێت. باشترین خووەکانیش بیرکردنەوەیە.

- کورم وریا به! چونکه به درێژایی ژیانت هەر شتێکی ناخۆش بێته سەر ڕێگات ئەنجامی بیرکردنەوە و ئەندێشـەی نەرێنی و ناڕاستە و، ئەگەر لە ژیانتدا بە بیرکردنەوەی چاک و خوداپەسەندانەوە بجوولێیت ژیانت پڕ دەبێت لە ئارامی و چێژ و بەرەکەت و، ئەگەر بیرکردنەوەی نادروسـت و نەرێنیـت هەبێـت ژیانـت بەردەوام لە داڵـغە و سـزا و نیگەرانی و ترس و خەمدا دەبێت.

- کـورم؛ هەر کاتێـک بینیـت هەرچـی دەنێریـت هەر ئەو شـتەت بـۆ دەگەڕێتەوە؛ ئەو کاتە بـزانە تووشـی گونـاه نەبوویت و ئەوەش بزانە بیرکـــردنەوە و کـــردەوەی تـــۆ درەنـــگ یـــان زوو بە وردییەکـــی سەرسووڕهێنەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆت و، هەوڵ بدە بۆ کردنی کارەکانـت هەرگیـز گلەیـی و سـکاڵا نەکەیـت و، تەنیـا داواکارییەکـانی خـۆت لە خـودا بوێـت، کـاتێ هەر یەک لە ئارەزووەکانـت دێـنە دی نیشـانەی هێزی خـودایە و، هەر سـەرکەوتنێکت و لە هەر (بیچمێک)دا بێت چ بچووک بێت چ گەورە سەرکەوتنی خودایە؛ کەواتە سـەرکەوتن لە هەر شتێکدا دەبێت وانەی خاکیبوون و خواپەرستیت پیشـان بـدات، نەوەک ببێتە هۆی ئەوەی لەخۆبایی بیت و لە یادی خودا غافڵ بیت.

- کورِم؛ ئەگەر بەر لە ئەنجامدانی کارەکانت بیربکەیتەوە ژیانت شیرین و دڵڕفێن دەبێت، هەتاکو پێتدەکرێت دەبێت چاکەکار بیت، چونکە تەنیا لە ڕێگای چاکەکاری و زیکری خودایە کە دەتوانیت چێژ لە ساڵەکانی ژیانت ببینیت و، ئەوەش بزانە لە ئەنجامدا هەموومان دەمرین، بەڵام هەر کەسێک کاری خراپ و ناشیرین بکات دوای مردن دەکەوێتە ناو تارکییەوە. کوڕی خۆم هەوڵبدە بە چاکەکاری و ڕێنوێنی خەڵک ڕۆژەکانی گەنجیت بەڕێ بکەیت، تاکو بەمجۆرە بکەویتە ناو ئارامی و ئاسوودەییەوە. ڕۆژانی گەنجی خێرا تێدەپەڕن کەواتە هەوڵ بدە گەنجیت بە گومرایی و ناشیرینی تێپەڕ نەبێت و، لە ڕۆژانی گەنجیدا ستایشی ئافرێنەری خۆت بکە بەر لەوەی ڕۆژانی سەختی ژیان دەست پێبکات، ڕۆژانێک کە ئیتر نەتوانیت چێژیان لێ ببینیت. سەرقاڵی بیرکردنەوە ببە و عیبادەتی ئافرێنەری خۆت بکە؛ بەر لەوەی هەورە ڕەشەکان گەمارۆی ژیانت بدەن و، ئیتر مانگ و هەتاو و ئەستێرەکان تییدا نەدرەوشێنەوە. عیبادەتی ئافرێنەرەکەت بکە بەر لەوەی دەستەکانت بلەرزن و پێیەکانت لاواز و چاوەکانت کز و گوێیەکانت گران بین و نەتوانیت ئاوازی دڵڕفێنی باڵندە و تاڤگەکان ببیستیت و، تۆ بە سەختی لاواز و نەتوانا ببیت و، نەتوانیت بڕۆیت بەڕێوە و، لە بەرزایی بترسیت و هێز و تینت لەناو دەچێت، کەواتە هەوڵ بدە ستایش و زیکری ئافرێنەری خۆت بکەیت بەر لەوەی داوی زیوینی ژیانت بپچڕێت و، جامی زێڕینی ژیانت بشکێت و، گۆزەکەت لە لای کانییەکەوە ورد بێت و، ئاشەکەت بێ خاوەن بمێنێت و هەڵبوەشێتەوە و، جەستەت ببێت بە خاکی زەوییەک کە لێی دروست بوویت و، ڕۆحت تا هەتایە لە تاریکی و چارەڕەشی و بەدبەختی سەرگەردان بێت. کەواتە کوڕی خۆم لە ڕێگای گوتنی زیکری خوا و ئەنجامدانی کردەوەی چاکەوە ڕۆحی خۆت بگەیەنە بە ئاستێکی باڵا و نوورانی و وای لێ بکە بفڕێت.

- کوڕی شیرینم؛ لەخواترسی بناغەی حیکمەت و ئاگاییە و، ناسینی خوای گەورە و پیرۆز دەبێتە هۆی ئەوەی کە زانا و گەشبین بیت، هەروەها بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خودا و چاکەکاری دەبێتە هۆی تەمەنێکی درێژ و پڕ بەرەکەت، بیرکردنەوە بەر لە ئەنجامدانی هەر کارێــک ســـوود و بەرەکەت و ئارامیــت پێدەبەخشــێت، ئەگەر لە ئەنجامدانی کارکانتدا بیر نەکەیتەوە زیان بە خۆت دەگەیەنیت، ئەوەش بزانە ئەگەر ماڵ و سامانی زۆرت هەبێت بەلام بیرکەرەوە و خواناس نەبیت هیچ بایەخێکی نابێت و، لە هەر شوێنێکدا بیر و یادی خودا هەبێت تەنانەت نانی وشکیش بەنرخترین خۆراکە.

- کوڕم؛ پشت بەستن بە خوای گەورە دەرمانێکە کە یارمەتیت دەدات بەرگەی ئازارەکان بگریت و، لە کارەکاندا پشوودرێژ و بەهێز بیت و، هەوڵ بدە ئالوودەی ئارەزووی دوور و درێژ نەبیت و، هەرگیز تووسی وەسوەسە نەبیت، چونکە ئارەزووی مەحاڵ و دوور و درێژ دەبێت بە هۆی ئەوەی بیرت تاریک و ڕەش ببێت و، گومڕات دەکات و لەناوت دەبات و، ئەگەر تۆ بەر بە هەڵەکانت نەگریت دڵنیابە هەڵەکانت بەرت پێ دەگرن و، لە هێنانی ناوی خودا و چاکەکاری دوورت دەخەنەوە، باشترین خەڵک ئەو کەسانەن کە لە خۆشحاڵی خەڵکدا دڵخۆش دەبن.

- کوڕم وریا بە! سەبارەت بە داهاتووت بە فیزەوە قسە نەکەیت، چونکە نازانیت لە داهاتوودا چی ڕوودەدات. هەروەها هەرگیز وەسفی خۆت مەکە و تا پێت دەکرێت هەوڵ بدە بە چاکەکردن وا لە خەڵک بکەیت ئەوان وەسفی تۆ بکەن. ڕاوێژ بە خەڵکی ژیر و بڕوادار وەکو عەترێکی بۆنخۆش و دڵڕفێنە. وەک چۆن مێشی مردوو دەتوانێت شوشەیەکی بۆنخۆش پیس بکات؛ ئەوا بێ فکری و بیرنەکردنەوە لە ئەنجامی کارەکانیش دەتوانن لە گەورەیی و کەسایەتیت کەم بکەنەوە.

- کوڕەکەم؛ تۆ بە کردەوەی چاک و زیکری خودای دلۆڤان دەتوانیت ناوێکی باش بۆ خۆت دروست بکەیت و، ناوی باشیش بۆنخۆشتر و دڵڕفێنترە لە باشترین عەترەکان. هەروەها بە کردەوەی چاک و زیکری خوای گەورە دەتوانیت وا بکەیت ڕۆژی مردنت لە ڕۆژی لەدایکبوونت جوانتر بێت. ڕۆیشتنی تۆ بۆ ماڵێک کە تێیدا تازییە دەگێڕن باشترە لە ماڵێک کە تێیدا ئاهەنگ دەگێڕن و، هەمووان سەرقاڵی گوناه کردنن. چونکە دەبێت مرۆڤ هەمیشە ئەوەی لەبیر بێت کە دواجار ڕۆژێک هەر دەمرێت. خەم لە پێکەنین باشترە، چونکە هەرچەندە دەموچاو خەمبار نیشان دەدات، بەڵام دەبێتە هۆی پاکژبوونەوەی دڵ.

- کوڕی خۆم؛ ئەگەر بێت و بەر لە ئەنجامدانی کارەکانت بیر نەکەیتەوە شەیتان لێت نزیک دەبێتەوە، ئەگەر بیرنەکردنەوەت هەمیشەیی بێت دەبێتە هۆی ئەوەی نەزان بیت و دنیا و قیامەتت دەفەوتێت. کوڕم ئەو شتانەی خراپەکاران لە ڕێگای کردەوە و قسە ئەنجامیان داوە وەکو گێژەبا و بە خێرایی لە (بیچم)ی بەڵا و کارەسات دەردەکەون و، دەیانخاتە عەزابەوە و، ئەو شتەی چاکەکاران ئەنجامی دەدەن لە (بیچم)ی ئارامیدا دێن و دەیانلاوێنن.

- کوڕم؛ پشت بەستن بە خوا ئومێد و کارسازی چاکەکارانە و، بە دڵنیاییەوە ئەنجامەکەی شادی و سەرکەوتنە، بەڵام خراپەکاران کە پێیان وایە هەموو شتەکانیان بە هۆی عیلم و فیکر و تەدبیری خۆیانەوەیە هەرگیز ئاسوودە نابن. خودا باشترین پارێزەرە بۆ چاکەکاران و وەکو قەڵایەکی پارێزراوە و، وەکو سەرابیش خراپەکاران نابوود دەکات. چاکەکاران هەمیشە لە ئاسوودەیی و ئارامیدا دەبن، بەڵام خراپەکاران و ناحەزان هەمیشە لە خەم و عەزاب و ترس و مردندا دەبن.

- کوڕی شیرینم؛ زار و دەمی چاکەکاران هەمیشە پڕە لە حیکمەت و زانایی و ئەزموون و ئارامی و، هیچ چەشنە فریو و فێڵ و مەکری خراپیان بۆت نابێت؛ هەڵبەت بەو مەرجەی بڕوایەکی تەواوت هەبێت. بەڵام زمانی خراپەکاران و دنیا پەرستان هەمیشە پڕە لە فێڵ و فریو، کەواتە کوڕم ئاگادار بە!

- کوڕم؛ ئەوە بزانە ئەگەر بیر و ئەندێشەت جوان بێت، نوورانییەت و جوانی بە ڕوخسارت دەبەخشێت. هەرچی زیاتر بیر لە هەموو کارەکان بکەیتەوە پتر دەتوانیت بگەیت بە ئامانج، ئەو ئەمەش ئەو کاتەیە کە باشترین چارەسەرەکانت دەست دەکەوێت. هەروەها خۆبەزلزانی و فیز و زیکر نەکردنی ناوی خودا ئافاتێکە بۆ لەناوبردنی عەقڵ و بیری تۆ.

- خەڵکــی چاکەکــار بە قســـە و کردەوەیـــان ئاســـوودەییت پــێ دەبەخشـــن، بەڵام زمـــانی فێڵبـــازان پـــڕە لە قســـەی ئـــازاربەخش و هاوشێوەی مار چزی هەیە و ئازاربەخشە.

- کوڕی ئازیزم ئاگادار بە! مرۆڤی خۆبەزلزان و لەخۆبایی هێندە مەغروورە کە هەرگیز گوێ لە دەنگی عەقڵ ناگرێت. لەخۆباییبوون بە هۆی عەقڵ و زانیاری و تەدبیر و ڕاوێژنەکردن بە خەڵک لە کارەکاندا جۆرێکە لە نەزانی و گومڕایی.

کەواتە بیرکـــردنەوە لە کارەکـــان + زانـــین و عـــیلم لە کارەکـــان + ڕاوێژکـردن لەگەڵ خەڵکی ژیـری بـڕوادار = سـەرکەوتن و ئـارامی و نوورانییەت و ڕۆح و سلامەتی جەستە.

- کوڕم وریا بە! غەیبەتکردن و زمانلووسـی و پاشـەملە قسـەکردن و، قسەی نەشیاو و بێهۆ، هەم دەبێتە هۆی گەندەڵبوونی ئەو کەسـەی قسەکە دەکات و، هەم دەبێتە هـۆی گومڕابـوونی بیسـەرەکەی، کەواتە ئاگاداربە نەچیتە ناو ئەو جۆرە کۆڕانەوە.

تەندروسـتی و سـەلامەتی جەسـتە لە گـوتنی زیکـری خـوا و، کەم خـواردن و، بە ڕێـک و پێکی نـانخواردنە. پڕکردنـی بەردەوامـی سـک، مرۆڤ بەهەڵپە دەکات و، مرۆڤی بەهەڵپە هەمیشـە موحتـاجە تەنانەت ئەگەر هەموو دنیاش هی ئەو بێت.

- کوڕەکەم؛ هەوڵ بدە بە درێژایی تەمەن و ژیانت لە کارەکانتدا چاوچنۆک و بە هەڵپە نەبیت، چونکە چاوچنۆکی و بە هەڵپەیی تووشی سەرگەردانی و نەخۆشیت دەکات و، هەمیشە لە نەخۆشێک دەچیت کە لە مردن نزیکە، نە چاک دەبیتەوە تاکو بگەیت بە ئارامی و، نە دەمریت، تاکو لە ڕووی جەستەییەوە ئاسوودە بیت، لە ڕاستیدا مرۆڤی چاوچنۆک و بە هەڵپە هەمیشە نەخۆشە.

- کوڕی خۆم؛ کەسی حەسوود هەمیشە ئازار دەچێژێت و خۆی بە سووک دەزانێت و، بە هۆی ڕق و کینەوە ڕوخساری ناشیرینە و، ئیرەیی وەکو تیرێکە کە لە لایەن مرۆڤە حەسوودەکانەوە دەهاوێژرێت؛ کە سەرەتا خۆیان دەپێکێت، پاشان خەڵک بریندار دەکات. ڕق و کینە و ئیرەیی زیاتر لە میهرەبانی و عیشق و پاکی بەسەر مرۆڤی حەسووددا زاڵە. کەواتە ئاگاداربە کەسانی حەسوود نەبن بە دۆست و هاوبەشت، چونکە تووشی عەزابت دەکەن.

- هەروەها کوڕم وەک چۆن مۆرانە بەرەبەرە بەهێزترین و پتەوترین دارەکان لەناو دەبات؛ ئیرەییش وەکو مۆرانە بیر و ئەندێشەت لەناو دەبات و دڵت (ڕۆح) ڕەش و تاریک دەکات. ئەوەش بزانە خراپترین دوژمن ئەو کەسەیە کە ئیرەییت پێ دەبات. هەڵبەت هەموو ئیرەییەکان و دوژمنییەکان لە ڕێگای چاکەکاری و زیکری خودا و یارمەتی خوای گەورە و یارمەتیدانی هەژاران لەناو دەچێت، هەڵبەت بە فەرمانی خوای گەورە.

- کورم؛ بزانه کەسانی پارەپەرست هەرگیز تێر نابن و، بەردەوام لە بیری کۆکردنەوەی پارە و سامانن و، هەرچی سامانەکەیان زیاتر ببێتەوە خەرج و خەمەکانیشیان زیاتر دەبێتەوە. پارە و سامانی کەسی ساماندار لێناگەڕێت ئاسوودە بژی، بەڵام باشترین سامان ئەوەیە کە بتوانیت ئەو سامانەی هەتە بیخەیتە خزمەت خەڵک و چاکەکاری و ڕەزامەندی خودا، نەک ئەوەی لە ڕێگای پارە و سامانەکەتەوە تووشی گوناه بیت و ڕۆحت سووک و سەرگەردان بکەیت.

- کوڕی شیرینم؛ ئەگەر خودا پارە و سامانی بە کەسێک بەخشی، دەبێت ئەو سامانە لە ڕێگای چاکە و ڕەزامەندیی خوا بەکاریبهێنێت، ئەگەر پارە و سامانی خۆی لە ڕێگای باشەوە بەکارهێنا؛ ئەوا بە درێژایی ژیانی تووشی خەم و مەراق نابێت و، هەمیشە لە ئاسوودەییدا دەبێت، بەڵام ئەو کەسانەی پارە و سامانی خۆیان لە ڕێگای خراپە و چێژە دنیاییەکانەوە بەکاردێنن؛ سامانەکەیان تەمەنیان بێهوودە و باتڵ دەکاتەوە و، بە درێژایی تەمەن و ژیانیان لە کۆرپەلەیەکی لەبارچوو دەچن کە بێهۆ لەدایک دەبێت و، دەچێتە ناو تاریکییەوە و، هیچ ناو و نیشانێکی لێ بە جێ نامێنێت و، چاوی ناکەوێتە هەتاو و، ئاگای لە هەبوونی خۆرەتاو نییە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئاسوودەییەکی زیاتری هەیە و، ئاسوودەیی ئەو زیاترە لە کەسێک کە ساڵەهای ساڵ ژیاوە و، هەموو هەوڵ و تێکۆشانەکانی بۆ چێژە پووچە دنیاییەکان بووە. کەواتە ئەو سامانداره‌ی سامانێکی زۆری هەیە و لە ڕێگای گوناهکاری و چێژە بێهۆکان خەرجی دەکات؛ چ جیاوازییەکی لەگەڵ کەسی هەژار و نەزاندا هەیە.

- کورِم؛ باشتر وایە مرۆڤ بەو شتەی هەیەتی قانع بێت نەوەک بەردەوام لە حەسرەتی بەدەستهێنانی شتێکدا بێت کە نییەتی.

هەروەها کێ دەزانێت لەم تەمەنە کورت و کاتییەدا کە هاوشێوەی سێبەر بزر دەبێت چی بۆ مرۆڤ باش و بەسوودە، هەروەها کێ دەزانێت چەند ساڵ دەژیت و لە ژێر ئاسمانی شیندا چی ڕوو دەدات. کەسێک بەردەوام بیری لە ڕابواردن و تێپەڕکردنی کات بێت نەزان و جاهیلە و، کەسی زانا بیر لە چاکەکاریی بۆ دوای مردن دەکاتەوە و، مرۆڤی نەزانیش بیر لە بێهوودەیی و ڕابواردن دەکاتەوە.

- کورِم؛ گوێگرتن لە ستایشی گەمژەکان وەکو خراپەکاری بێهودەیە. هەروەها پێدان و وەرگرتنی بەرتیل کەسی زانا نەزان و بێنرخ دەکات و، دەبێتە هۆی ئەوەی دڵی گەندەڵ و ڕەش ببێت. هەروەها بیرکردنەوە و حیکمەت و زانایی و گوتنی زیکری خودا و چاکەکاری لە هەموو سامانێک بەنرختر و بەسوودترە.

- کوڕی خۆم؛ بەسەر تووڕەیی خۆتدا زاڵ بە، چونکە تووڕەیی تێکت دەدات و، توانای تێگەیشتنت لەناو دەبات. هەروەها حەسرەتی ڕۆژانی ڕابردوو مەخۆ و، بیر لە داهاتوو مەکەوە و، هەموو کارەکانت بسپێرە دەستی خودا. زانست و سامان هەردووکیان پێکەوە بەسوود و بەبایەخن، بەڵام سامان کاتێک بەسوودە کە لە کاتی بەکارهێنانیدا کەڵک لە حیکمەت و زانست و بیرکردنەوە و چۆنیەتی باش بەکارهێنانی وەربگیرێت. کەواتە کاتێک بەختەوەری ڕووت لێ دەکات کە لە کارەکانتدا تێبکۆشیت و، سامان و داهاتی خۆت لە ڕێگای ڕەزامەندیی خودا و چاکەکاری بەکاربهێنیت.

- کورم ئاگاداربە! جگە لە ڕێگای حەڵاڵەوە نابێت لە ژنان نزیک نەبیتەوە، چونکە لە گەورەترین گوناهەکانە و، هەم لە دنیا مرۆڤ سووک دەکات و، هەم لە دنیای پاش مردنیش تووشی گەورەترین عەزابەکانی دەکات. کەواتە وریا بە! ژنانی سۆزانی و زیناکار زۆر فێڵبازن و، فێڵبازیی ئەوان تاڵترە لە خراپترین جۆری مردن و، پیاوان تووشی خراپترین دۆخ دەکەن و، قۆڵەکانی ژنی زیناکار وەکو کەمەند پیاوان بەند دەکات، هەروەها ئەگەر کەسێک بە شوێن ڕەزامەندی خوداوە بێت بە دڵنیاییەوە ڕزگار دەبێت، بەڵام مرۆڤی گوناهکار گرفتار دەبێت. کورم چەند باشە ئەگەر مرۆڤ زانا بێت و بەر لە کردنی هەر کارێک بیر بکاتەوە و، فەرمانەکانی خودای گەورە کە لە ڕێگای کتێبە ئاسمانییەکانەوە نازڵ بوون جێبەجێی بکات و، سەرپێچی لە فەرمانەکانی خودا نەکات.

- کوڕەکەم؛ قسەی کەسانی ئیماندار و ژیر دڵنشینە و پڕە لە ئارامی و ئەزموون، بەڵام قسەی کەسانی نەزان دەبێتە هۆی فەوتانی خۆی و ئەو خەڵکانەی کە پشتگیری لێ دەکەن. سەرەتای قسەی کەسی نەزان گەمژەییە و کۆتاییەکەی شێتی و گومڕایی و تاریکی و چارەڕەشییە. مرۆڤی نەزان تەنانەت لە ئەنجامدانی بچووکترین کاریشدا گۆشەگیر و ماندوو دەبێت. هەروەها کوڕم بە دەستکراوەیی و گەورەیی و بە بڕوایەکی تەواو سامانەکەت لە ڕێگای خودا خەرج بکە و، دڵنیابە خوا لە بەرامبەردا چەند قات پێت دەبەخشێتەوە. وەک چۆن نازانیت چۆن باران دەبارێت و، با چۆن شنەی دێت و، جەستەی منداڵ چۆن لەناو سکی دایکیدا دروست دەبێت؛ کەواتە ناشتوانیت لە کارەکانی خودا کە ئافرێنەری هەموو شتێکە تێبگەیت و تەنیا دەتوانیت بە سەبر و چاکەکاری و زیکری خودا تۆسقاڵێک لە حیکمەتەکانی خودا ببینیت؛ هەڵبەت بە پشوودرێژی و تێپەڕینی تەمەن.

- کوڕی ئازیزم؛ بزانە کە ئەگەر خودا عەقڵت لێ بستێنێتەوە و تەواویی گۆی زەوی پڕ بێت لە سامان و ئاڵتوون و هی تۆ بێت، بەکەڵکی هیچ نایەت و، زۆر زوو سامانەکەت لەناو دەچێت. کوڕم عەقڵ هێزێکە بانگهێشتت دەکات بەرەو چاکەکاری و، عەقڵ لە سەرووی تەندرووستییەوەیە. چونکە دەتوانیت بە عەقڵ تەندروستی بەدەست بهێنێت و، کەسی عاقڵ تەنیا بۆ خۆی ناژی، بەڵکو بۆ خێر و سەلاحی کەسانی دیکەش دەکۆشێت.

- کوڕەکەم؛ ئەوە بزانە کە دەسەلات و دەوڵەمەندی بەر لە هەموو کارێک پەیوەندی بە ئەندێشە و بیرکردنەوەوە هەیە، ئەگەر بێ ئەوەی بیر بکەیتەوە دەست بۆ هەر کارێک ببەیت شکست دەهێنیت و، بیرکردنەوەت دوای دۆڕان هیچ سوودێکی نابێت. عەقڵ و ئەندێشە ئەگەر لە کاتی خۆیدا بێت و، بەر لە ئەنجامی هەر کارێک بێت لە زێڕ بەبایەخترە. مرۆڤی ژیر هەمیشە لە ئەزموون و شکستی خەڵک ئەزموون وەردەگرێت و، ژیر ئەو کەسەیە کە خۆی بە بیرکردنەوە و عەقڵ پەروەردە کردووە و، هەمیشە لە کارەکانیدا سەرکەوتووە.

- کوڕم؛ هەوڵ بدە هەمیشە لە هەموو کارەکانتدا عاقڵ بیت و بیر لە ئەنجامی کارەکانت بکەیتەوە و، هەوڵ بدە لەگەڵ کەسانی نەزان و لەخۆبایی ڕاوێژ نەکەیت. چونکە کەسانی نەزان خۆیان بە عاقڵ دەزانن و هیچکات ڕاوێژ ناکەن، هەوڵ بدە لەگەڵ کەسانی ژیردا ڕاوێژ بکەیت. کەسانی ژیر ئەو کەسانەن کە لە هەموو بوارەکاندا بیر دەکەنەوە و، کەمتر قسە دەکەن و، بەردەوام بیسەرن و، لە ڕێگای بێدەنگی و گوێگرتنەوە هەموو ئەزموونەکانی خەڵکانی تر وەردەگرن بێ هیچ زیانێک.

- کوڕی شیرینم؛ ئەوە بزانە هیچ سامانێک نییە لە سەرووی عەقڵەوە بێت و، ئەگەر تۆ یەکێک بیت لە دەوڵەمەندترین کەسەکان و عەقڵ و ئەندێشەت نەخەیتە کار بۆ ئەنجامدانی کارەکانت هەر زوو تووشی چارەڕەشی و لەناوچوون دەبیتەوە، هەروەها ئەگەر تەنانەت یەکێک بیت لە هەژارترین خەڵک، بەڵام بۆ ئەنجامدانی کارەکانت کەڵک لە ئەندێشە و ئەقڵت وەربگریت؛ دڵنیابە زۆر زوو هەم لە ڕووی ماددییەوە و هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە سەردەکەویت.

- کوڕی خۆم؛ باشترین هاوڕێیەکانت ئەو کەسانەن کە وتەکانیان وات لێ بکات زانست و ئاگاییت گەشە بستێنێت و، هەوڵ بدە بیر لە ئافرێنراوەکانی خودا بکەیتەوە کە لە سروشتدان و، تامەزرۆی زانین و تێگەیشتنیان بە، چونکە ڕزگاری لە بیرکردنەوە و زانایی و ئاگایی سەبارەت بە ئافرێندراوەکانی خودایە و، ناسینی ئافرێنراوەکانی خودا عیبادەت و ناسینی خودایە، لەم ڕێگایەشەوە دەتوانیت لە دەستەڵات و گەورەیی خودای گەورە تێبگەیت.

- کوڕی ئازیزم؛ وەکو گەورەترین چەکی دەستت و گەورەترین ڕچەشکێن و پارێزەری گیان و ڕۆحت سەیری ئەندێشەت بکە، وریابە بیرکردنەوەت دەتوانێت لە جەستەت تێپەڕێت و کاری چاکە بکات، جەستەی تۆ بە تەواوی لە ژێر ڕکێفی بیرکردنەوە و ئەندێشەی تۆدایە، هەر بۆیە ئەگەر بەر لە هەموو کارێک بیر بکەیتەوە دەتوانیت بە باشترین شێوە کارەکانت ئەنجام بدەیت و، هەمیشە سەربکەویت و بەردەوام لە ئاسوودەییدا بیت.

- کوڕەکەم؛ کاتێک کاری چاک دەکەیت و بەردەوام بیر لە ئافرێندراوەکانی خودا دەکەیتەوە و، سەرقاڵی زیکری خودایت؛ خوداش لەگەڵتدایە و، کاتێ خودات لەگەڵ بێت هیچ خەمێک ئازاری جەستە و ڕۆحت نادات و، ڕۆژانی ژیانت بێزارکەر نابن و، هەرگیز لە تەنیایی وەڕەس نابیت و، چێژ لە تەنیایی دەبەیت و، هەمیشە لە ژیان و زیکری خوا چێژ دەبینیت، هەروەها چێژ لە سەیرکردنی ئەستێرەکانیش دەبینیت.

- کوڕم؛ تۆ لەناو بیر و هزری خۆت و لە کاتی زیکری خودا داوا لە خودا بکە و بڵێ: خودایا عەقڵ و ئەندێشەم نوورانی بکە تاکو لە ڕێگای ڕاستی ژیان تێبگەم و، دڵێکم پێ ببەخشە تاکو میهرەبانی و چاکە و ڕاستی بە مرۆڤەکان ببەخشم. هەروەها بڵێ: خودایا بارانی بەخششی نوورانییەت بە سەر عەقڵ و ئەندێشەمدا ببارێنە و، لە کاتەکانی تەنیاییمدا ببە بە هاودەم و هاوڕێ و هاونشینم، چونکە پشتم بە تۆ بەستووە و هیوام تەنیا بە تۆیە، هەر بۆیە هیوا بڕوام مەکە و، چاوم لە بەخششی بێ بڕانەوەی تۆیە.

- کوڕی خۆشەویستم؛ گوتنی زیکری خودا لە ڕێگای فیکر و ئەندێشەوەیە. داوا لە خودای گەورە بکە و پێی بڵێ: ئەی خودای عالەمیان و، ئەی میهرەبانترینی میهرەبانان، بە یادی خۆت ساتە ناوازەکانی گەنجیم نوورانی بکەوە و، لە هەر بەرزی و نزمییەکدا و، لە هەموو ساتەکانی ژیاندا یارمەتیم بدە. ئەی دوورخەرەوەی خەمەکان تەنیا هانا بۆ تۆ دێنم، لە شەڕی بێ فکری و هەڵەکانم. ئەی ڕووناککەرەوە، ساتەکانی گەنجیم بە بیرکردنەوە و عەقڵ و ئەندێشەی باڵا بەرز ڕووناک بکەوە.

- کوڕم؛ کاتێ ڕۆدەچیتە ناو قووڵایی بێدەنگییەوە جوانی و ئارامیی ڕۆح ئەزموون دەکەیت و، کاتێک دەچیتە قووڵایی بێدەنگی و زیکری خوداوە هەموو ترسەکانت لەناو دەچن و، گوتنی زیکری خودا لەناو بێدەنگیدا لە ڕادەبەدەر جوانە. کاتێک تۆ لە بێدەنگیدا زیکری خودا دەکەیت پەیوەست دەبیت بە نوورانییەتی خودا و، پێتخۆشە هەمیشە لەو خەڵوەتەدا بیت و، لێوانلێو بیت لە زیکری خودا و نوقمی ڕووناکی ژیانبەخشی خودا بیت.

- کوڕی خۆم؛ ئاوازی دەنگی ئەو دڵەی لە حاڵی وتنی زیکری خودایە دڵڕفێن و ئارامبەخشە و، بیر و ئەندێشەی خودایی، بانگێکی ناوازە و دڵڕفێنە. کوڕم ناتوانیت خۆت لە هاونشینی خەڵک بدزیتەوە، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ خەڵک بەختەوەریت پێ نابەخشێت و، گەشە بە ڕۆحت نادات. تاقە بەختەوەری ئەوەیە لەگەڵ مرۆڤی خوداناس و خوداترس پەیوەندیت هەبێت و، بیر و ئەندێشەیەکی خودایی و، زیکری خودا بەختەوەری لە ڕۆح و جەستەی تۆدا جاری بێت و، ڕۆحت نوورانی بێت و ئاسوودە بیت.

- کوڕم وریا بە! هەر کاتێک ویستت ژن بهێنیت هەوڵ بدە زانیاری تەواو لەسەر ئەو کەسە بەدەستبهێنیت کە دەتەوێت لەگەڵی بژیت و، هێندە باش بیناسیت کە ژیانی هاوبەش لەگەڵ ئەو چێژبەخش بێت بۆت. هەروەها ژنێک بێنە کە لە هەموو لایەنەکانەوە لە تۆ بچێت و، هەموو تایبەتمەندییەکانی لە پێش چاوی خۆت و خەڵکەوە پەسەند بێت. هاوسەری باش و ژیر و لەخواترس باشترین یاری ژیانە.

- کوڕی شیرینم؛ ئەوە بزانە بێدەنگی بۆ کەسی زانا و نەزان بەبایەخە، چونکە بێدەنگی عەیبی نەزان دەشارێتەوە و کەسی دانا گەورەتر دەردەخات. کەواتە کوڕم لە هەموو بوارەکانی ژیاندا یان بە وردی و ژیرانە بدوێ، یان بێدەنگی هەڵبژێرە. چونکە ئەگەر بە وردییەوە قسە بکەیت وشەکانت دڵڕفێن دەبن. یان ئەگەر قسەیەکت نییە بۆ گوتن بێدەنگ بیت باشترە لەوەی بێهودە قسە بکەیت.

- کوڕم؛ ئەوە بزانە ئەگەر بە درێژایی تەمەنت بێدەنگ بیت و خەڵک داوات لێ بکەن قسەیان بۆ بکەیت؛ باشترە لەوەی بەردەوام قسە بکەیت و قسەکانیشت بێهودە بن و، خەڵک ئازار بدەیت و، خەڵک داوات لێ بکەن بێدەنگ بیت، کەواتە هەوڵ بدە بەر لەوەی قسە بکەیت بە وردی و بیرکردنەوە و ژیرانە قسە بکەیت و، ئەوەش بزانە کەمت پێ بێت و زۆر قسە بکەیت وەکو ئەوە وایە هەژار بیت و پارەی زۆر خەرج بکەیت.

- کوڕی ئازیزم؛ باشترین و بەسوودترین شتێک کە دەتوانێت مرۆڤەکان بگەیەنێت بە کەماڵ، کاتە. هەرچی زاناتر بیت کات بەنرختر دەبێت. بەفیڕۆدانی کات گرانترین خەرجییەکانە و، مەرگ زۆر بە خێرایی لێت نزیک دەبێتەوە؛ کەواتە باشتر وایە بە باشترین شێوە لە کاتەکەت کەڵک وەربگریت. هەوڵ بدە خۆت بە چاکەکاری و گوتنی زیکری خوداو سەرقاڵ بکەیت، چونکە کات کەمە و مرۆڤی ژیر هەل و کات دەکات بە داهاتوویەکی چاک و پڕ بەختەوەر.

- کوڕی شیرینم؛ هیچ جوانییەک لە بیرکردنەوە و ئەندێشە باشتر نییە و، هیچ سامانێکیش باشتر و بەهێزتر لە عەقڵ نییە و، بیرکردنەوە بناغە و ئەساسی عەقڵە و، ئەو کەسانەی لە کارەکانیاندا ژیرانە بیر دەکەنەوە هەرگیز تووشی شکست نابن. هەروەها هەر چەشنە کردەوە و قسەیەک لە ڕێگای عەقڵەوە شیبکەرەوە و بە وردی سەرنجی هەموو لایەنەکانی بدە؛ ئەوسا بۆتان دەردەکەوێت کە ئایا ئەو کارە بکەیت یان نا.

- کوڕەکەم؛ڕێگای ژیان پڕە لە لەمپەڕ و کێشەی زۆر، تەنیا ئەو کەسە دەتوانێت لەم ڕێگا پڕ مەترسییەوە تێپەڕێت کە لە کارەکانیدا بیر بکاتەوە و، پشت بە خوا ببەستێت و، ڕۆح و جەستەی پڕ بێت لە هیوا و، نائومێدی دزە نەکاتە ناخیەوە و، لە کارەکانیدا تێبکۆشێت، نەک ئەوەی چاوەڕێی بەخت و شانس بکات. دانا کەسێکە وا لە کارەکانیدا بیر بکاتەوە و، بۆ سەرکەوتن پشت بە کۆششی خۆی دەبەستێت، بەڵام کەسێک کە نەزان بێت هەمیشە پشت بە ئارەزووی مەحاڵ و نامومکین دەبەستێت.

- کوڕی خۆم؛ هیوا نیوەی بەختەوەرییە. ئومێدەواری و هیوا لە کار و ژیاندا زۆر گرنگە و، لە باڵی باڵندە دەچێت کە چەند بۆ فڕین پێویستە. ئومێد و ئومێدەواری بەخشش و نیعمەتێکی گەورەیە. ئەگەر ئومێد و ئومێدەواری نەبوایە هیچ دایکێک شیری بە منداڵەکەی نەدەدا و، هیچ باخەوانێک داری نەدەچاند. کەواتە کوڕم؛ ئومێدت بە دنیای دوای مردن هەبێت و ،بەردەوام چاکەکاری بکە و، هیوای خۆت بەدەست مەدە.

- کوڕی خۆشەویستم؛ بڕوا و عیشق بەرامبەر بە خودا دڵەڕاوکێ و نائومێدیت لێ دوور دەخاتەوە و، وەکو ڕووناکییەکە کە تاریکی لەناو دەبات.

تەنانەت ئەگەر تەنیا ساتێک بیر لە خودا بکەیتەوە ترست لە دڵدا نامێنێت و، بیرکردنەوەت دەبێتە هۆی ڕزگار بوونت لە کارەکاندا، بەڵام ئەگەر بێت و بۆ ساتێک لە خودا دوور بکەویتەوە و هیچ ئەندێشەیەک لە تۆدا بوونی نەبێت؛ ترس هەموو گیانت داگیر دەکات و، دەبێت بە هۆی لەناوچوونت.

- کوڕم؛ ئەوە بزانە دووری لە کەسانی بەدفەڕ و بێبڕوا دەلاقەیەکە کە بە ڕووی بەختەوەریدا دەکرێتەوە، هەر بۆیە هەمیشە هەوڵ بدە زمانت لە ژێر ڕکێفی عەقڵتدا بێت و، قسەی گونجاو و ژیرانە بکەیت و، هەوڵ بدە هەرگیز لێنەگەڕێیت زمانت بەر لە ئەندێشەت بجووڵێت. هەوڵ بدە لە کاتی قسەکردندا قسەی بێهودە نەکەیت و، مەڕوانە بۆ ئەوەی بزانیت چ کەسێک قسە دەکات، بەڵکو سەرنج بدە بزانە چی دەڵێت!

- کوڕی خۆم؛ مرۆڤ هەمیشە نیوەی بەتاڵی پەرداخەکە دەبینێت و، تەرکیز دەخاتە سەر ئەو شتانەی کە نیەتی و، چێژ لەو شتانە نابینێت کە هەیەتی. بەڵام تۆ هەوڵ بدە لەو شتانەی خودا پێی داویت ڕازی بیت و، بۆ ئەو شتانەش کە دەتەوێن ئارام و خۆڕاگر بیت و، هەرچییەکت لە دڵەوە بوێت لە خودای داوا بکە و، دڵنیابە لە ڕێگای سەبر و پشت بەستن بە خودا مرازت حاسڵ دەبێت؛ هەڵبەت ئەو مرازانەی خودا بۆ تۆ بە باشی دەزانێت.

- کوڕەکەم؛ هەوڵ بدە هەرگیز خێرا و بە پەلە قسە نەکەیت و، بەردەوام بە نەرمییەوە بدوێیت. کەسێک کە بە نەرمی و هێمنی قسە دەکات هەم خۆی لە ئاسوودەییدایە و، هەم خەڵک دەخاتە ئاسوودەیی و متمانەوە. هەمیشە ئاگات لە زمانت بێت، چونکە خەڵک سەرەتا سەرنجی قسەکانت دەدات؛ ئەوسا بڕیار لەسەر کەسایەتیت دەدات. هەوڵ بدە بە باشترین شێوە زمانت و ئەو وشانەی لە زارت دێنە دەرێ هەڵبژێریت، چونکە کە وشەیەک لە زارت دەرچوو ئیتر ناگەڕێتەوە. هەروەها هەوڵ بدە یان بە دروستی قسە بکەیت یان ژیرانە بێدەنگی هەڵبژێریت، چونکە قسەکردن لە کاتی پێویستدا گەورەترین سەرکەوتنەکانە.

- کوڕی شیرینم؛ ئەو کەسانەی هەرچییەک دەکەن یان بۆ گەیشتن بە چێژە یان بۆ ڕزگار بوون لە ئازارەکان، بەردەوام هزر و ئەندێشەی خۆیان بۆ چێژ و خۆشییە پووچەکانی دنیا بەکاردەهێنن، نازانن هەر ئەم چێژە پووچە دنیاییانەن کە دەبن بە هۆی نائارامی و عەزابیان. کەواتە کوڕم ئەوە بزانە تەنیا هزرێکی خودایی دەکەوێتە ناو ئارامییەوە، بۆیە هەوڵ بدە هزری خۆت لە ڕێگای زیکری خوداوە، خودایی بکەیتەوە.

- کوڕی ئازیزم؛ ئەوە بزانە ژیان دژوارە، لە ڕادەبەدەر دژوار و تاقەتپڕووکێنە، لەم ڕێگا پڕ مەترسییەدا کێشەکانت دانە و دووان نین و، ئارەزووە دەروونی و ڕووداوە دەرەکییەکان گەورەترین کێشەکانت بۆ دەنێنەوە و، داوێکی ئاڵۆز لە ژیانتدا دروست دەکەن. بەڵام دڵنیابە، ئەگەر تۆ هەوڵ بدەیت هەمیشە لە ژیانتدا سەرقاڵی بیرکردنەوە و زیکری خودا و چاکەکاری بیت؛ کێشەکان نایەنە ناو ڕێگات و دەتوانیت بە ئاسانی لە سەفەری ژیان بەردەوام بیت.

- کــوڕم؛ زەمــان گرنگتــرین و بەنرختــرین شــتێکە کە مرۆڤێــک دەتوانێت سوودی لێ ببینێت و، هەرچی زاناتر بیت بەفێرۆدانی کات گرانتـر دەبێـت بـۆت و، کـات بەنرختـرین نیعمەتـێکە کە دەتوانیـت لە ژیانتدا هەتبێت. کەواتە هەوڵ بـدە کـاتی خـۆت لە ڕێگـای ڕەزامەنـدی خوا و چاکەکاری و نوورانیکردنی ڕۆحی خۆتەوە بەکاربیهێنیت؛ دەنـا زۆر زیان دەبینیت و ڕۆحت تاریک دەکەیت و دەکەویتە عەزابەوە.

- کوڕی خۆم؛ هیچ چارەیەک بۆ لەدایکبوون و مـردن نییە؛ کەواتە باشـترە بە درێژایـی ژیـان باشـترین کەڵـک لە کـات و تەمەنـی خـۆت وەربگریـت. ئەم دنیـایە فـانییە و زوو کۆتـایی پێـدێت، دواجـار هەر ڕۆژێک کۆتایی پێدێت. دەوڵەمەند بیت یان نا هـیچ جیاوازییەکی نییە، لەم دنیـا فـانییەدا دەوڵەمەنـد تەنیـا جەسـتەی لە ئاسـوودەییدایە، بەڵام دەوڵەمەنـدی ڕاسـتەقینە کەسـێکە وا لەم دنیــایەدا بە چاکەکــاری و گوتنی زیکری خوا و لە ڕێگای ڕەزای خوادا تێبکۆشێت. تـاکو ڕۆحـی لە دنیایەکی تردا لە ئاسوودەییدا بێت.

- کوڕی ئازیزم؛ تـاقە سـامانی بەنرخـی تـۆ بە درێژایـی تەمەنت لەم دنیا فانییەدا؛ تەنیا کاتە، ئەگەر کات تێپەڕێت هەرگیز ناتوانی بەدەستی بهێنیتەوە، ئەو کەسـانەی بە درێژایـی تەمەنیان هەمـوو کارەکانیـان بە دروستی و چاکەکاری دەکەن، ئەو کەسانەن کە کات و ژیـانی خۆیـان دەکەن بە باشــترین ســەرمایە، هەڵــبەت نەک ســەرمایەیەک کە لەم دنیایەدا ببێت بە مایەی چێژ و ڕابواردن؛ بەڵکو سـامانێک کە لە دنیـای دوای مردن ڕۆح بخاتە ناو ئارامی و ئاسوودەییەوە و بیباتە بـالاترین پلەوە.

- کـــوڕەکەم؛ هەوڵ بـــدە پێـــنج شـــت هەن کە باشـــترە بەر لە ئەزموونکردنیان بە باشی نرخیان بزانیت.

١. گەنجیەتی بەر لە پیری و نەتوانایی و سستی.

٢. تەندروستی بەر لە نەخۆشی و ڕەنج و عەزاب.

٣. بێنیازی بەر لە هەژاری و دەستکورتی و سەرشۆڕی.

٤. ئاسوودەیی و ئارامی بەر لە گرفتاری و دەرماندەیی.

٥. ژیان بەر لە هاتنی مردن و لەناوچوون.

- کوڕی خۆم؛ لەگەڵ هەژارترین مرۆڤەکان وا هەڵسوکەوت بکە و هێنـدە بە ڕێـزەوە لەگەڵیـان مـامەڵە بـکە وەک ئەوەی بڵێیـت لەگەڵ دەوڵەمەندێکـدا مـامەڵەت کـردووە. هەروەهـا لەگەڵ هەژارتـرین و تەنـانەت دەوڵەمەنـدترین خەڵکـدا وەکـو یەک مـامەڵە بـکە، چـونکە بەڕێزتـرین کەســەکان لە پـێش چـاوی خـودا بە تەقـواترین و چاکەکارترینەکانن، نەک دەوڵەمەندەکان، لە دنیای پاش مردنیشدا هەر کەسـێک بە پێـی ئەو کـارانەی کردوویەتـی دەناسـرێت و پاداشـت وەردەگرێـت، نەک بە پێـی ئەو شـتەی بە درێژایـی تەمەنـی کـۆی کردووەتەوە.

- کوڕی شیرینم؛ بە شێوەیەک داهات و گوزەرانی خۆت دابین بکە کە نەبێتە هـۆی برینـی داهـاتی کەسـێکی تـر و، هەرگیـز لای ئەو کەسانەی زۆر لە خۆت دەوڵەمەندتر یان زۆر هەژارترن باسی پارە مەکە، چونکە ئەگەر لای کەسی دەوڵەمەند باسی پارە بکەیت پێیوایە پێویسـتت بە پـارەیە و، ئەگەر لە بەرچـاوی کەسـی هەژار باسـتکرد پێیـوایە پارە و سـامانی خـۆت دەنوێنیـت و زۆر دڵسـارد دەبێتەوە و خەم دەخوات.

- کوڕی ئـازیزم؛ تـۆ هەرگیـز ناتوانیـت بە پـارە هـاوڕێ و هـاودەم بکڕیت، بەڵام ئەوە بزانە بە چاکەکاری و هەڵسوکەوتی چاک و قسەی چاک دەتوانیت هەموو دنیا بکەیت بە هـاوڕێ و دۆسـتی خـۆت . دوو کەس باشـــتر لە مانـــای هەژاری تێـــدەگەن، یەکەم؛ ئەو هەژارەی دەوڵەمەند بووە و، دووەم ئەو دەوڵەمەندەی هەژار کەوتووە. ئەوەش بزانە لە ژیاندا سامان هەموو شتێک نییە و، بەختەوەری راستەقینە لە کـۆکردنەوەی سـاماندا نیـیە، بەڵام زۆربەی خەڵـک تووشـی ئەم هەڵە گەورەیە دەبن و، پێیان وایە سامان هەموو شـتێکە، هەر بۆیە هەمـوو تەمەنـی خۆیـان لەم ڕێگـایەدا سـەرف دەکەن و، ناشـزانن بەم کـارە ڕۆحیان لێڵ و تاریک دەبێت.

- کوڕم؛ ئەوە بزانە میهرەبانی و قسەی چاک و ئەدەب، پارەیەکی زۆری ناوێت، بەڵام دڵنیابە دەبێت بە هۆی ئەوەی هەموو شـتێک بێت بۆ لای تۆ و، تۆ دەکاتە هاوبەشیماڵی خەڵک. کوڕم هەر شتێک زۆر بـوو نرخـی نامێنێت، بەڵام زانسـت و عـیلم و گـوتنی زیکری خـودا و چاکەکـاری هەرچـی زۆرتـر بـن ئـازیز و پیـرۆز دەبـن و، کەسـێکیش دەتوانێت سوود لە زانست و عیلمی خۆی ببینێت کە بە کردار کەڵک لەو زانسـتە وەربگرێـت و، دەبێـت هەوڵ بـدات کـاتێ کە ئامۆژگـاری خەڵک دەکات خۆیشی ئەو کارانە ئەنجام بدات.

- کوڕەکەم؛ جێگای عیلم و زانستی پاکژی ئیلاهی لە دڵەکاندایە و، تۆ هەوڵ بدە بۆ گەیشتن بە کەماڵ فێری عیلم و زانست بیت نەک ئەوەی ئەو زانستە بۆ گاڵتەکردن یان مشتومڕ لەگەڵ خەڵک بەکاربهێنیت. کەواتە بۆ ئەوەی عیلم و زانستت پەرە بستێنێت هەوڵ بدە لەگەڵ کەسانی ژیر ڕاوێژ بکەیت و، پرسیان پێ بکەیت و، بۆ تێگەیشتن لە هەر شتێک لە کەسانی ژیر و لەخواترس یارمەتی وەربگریت و، سەبارەت پێی پرسیار بکەیت و، هەرچی زیاتر بیربکەیتەوە پتر فێری هەموو چەشنە زانستێک دەبیت. باشترین بەندەکانی خودا ئەو کەسانەن کە بەردەوام خەریکی بیرکردنەوە و ئەندێشە و زیکری خودان.

- کوڕم؛ هەوڵ بدە لەگەڵ خەڵک بە ئەدەبەوە مامەڵە بکەیت و، ڕێز لە هەموو ئافرێندراوەکانی خودا بگریت و، هەرگیز ئیرەیی بە کەسێک مەبە. خووە ناشیرین و خراپەکان بەتایبەت تووڕەیی و غەزەب لە خۆت دوور بخەیتەوە و لێ مەگەڕێ ڕەفتارت خراپ بێت. هەڵسوکەوتی چاک و باش لە ئاوی باران دەچێت کە دەبێتە هۆی زیندووبوونەوە و گەشە و پشکەوتنی هەموو ڕووەکەکان. کەواتە تۆش هەوڵ بدە وەکو باران خاوێنکەرەوە و ژیانبەخش بیت.

- کوڕی خۆم؛ ئەو کەسانەی و بێپروان لە دەفری قوڕین دەچن و زوو دەشکێن و، زۆر بە سەختی پێکەوە دەلکێن و هاوڕێیەتی و هاتوچوون لەگەڵ کەسانی بە ئابڕوو و بڕوادار باشترین بەهێزکەرەوە و، نوورانیکەرەوەی ڕۆحی مرۆڤن، چونکە ئەخلاقی باش لەو نوورە دەچێت کە بۆ هەموو شوێنێک شەوق دەداتەوە و، چوار دەوری خۆی ڕووناک دەکاتەوە. هەڵسوکەوتی باش بۆ مرۆڤەکان لە باڵی باڵندە دەچن؛ کەواتە هەوڵ بدە باڵی خۆت بەهێز بکەیت.

- کوڕی شیرینم؛ بە درێژایی تەمەنت و ئەو ماوەیەی دەژیت دەبێت لێبوردە و بەخشندە بیت و، لە هەموو کەسێک ببووریت و، داوای لێبوردنیان قەبووڵ بکەیت. هەروەها بە شێوەیەکی باش ژنان لەبەر ئەوەی لاوازن، چاکەکاران لەبەر ئەوەی مەبەستێکی خراپیان نییە و خراپەکـــاران لەبەر ئەوەی بەدبەخـــت و چارەرەشـــن، ئەگەر لە کارەکانتـدا هەڵەیەکیـان کـردووە، ئامۆژگارییـان بـکە و، ئەوە بـزانە باڵاترین بەخششەکان گەیاندنی حەقە بە خاوەن حەق.

- کـــوڕم؛ کاتێـک کەســـانێک خـــراپەت لەگەڵ دەکەن و پاشـــەملە باسـتدەکەن، هەوڵ بـدە قسـەکانیان پشـتگوێ بخەیـت، ئەگەر ببینیـت بەرامبەر بە تـۆ خـراپە و سـتەم دەکەن ئیهمالیـان بـکە. ئەگەر تـۆ ئەو قۆناغە دژوارانە تێبپەڕێنیت ئەو کاتەیە کە ئیتر تۆ لە دەستی زمانی خەڵک و، خەڵک لە زمانی تـۆ پارێزراوە. ئەم تایبەتمەندییانە باشترین و گەورەترین تایبەتمەندییەکانن کە تۆ بەخشش و لێبوردەییت هەبێت بەرامبەر بە داگیرکردن و بەخششت هەبێت لە کاتی دەستکورتیدا و، لێبوردە و میهرەبان بیت لەکاتی بەهێزیدا.

- کوڕەکەم؛ بەخشش و دەست و دڵکراوەیی لە زۆر بەخشیندا نییە، بەڵکـو لە بەخشـین لە کـاتی پێویسـتدایە. هەوڵ بـدە لە ڕێگـای میهرەبانییەوە تـووڕەیی لەنـاو ببەیـت و، بە چـاکەکردن خـراپە و، بە بەخشین ئازار لەناو ببەیت و، بە ڕاستی وەڵامی درۆ بدەیتەوە، ئەگەر هـات و یەکێـک بەرامـبەر بە تـۆ سـتەمێکی کـرد و داوای لێبـوردنی لێکردیت، لێخۆشبوون لە هەڵەکانی بە ئەرکی سەرشانی خۆت بزانیت و، ئەگەر بەرامبەر بە تـۆ بێئەدەبی کـرد، هەر کە لێـی خـۆش بوویـت ئیتـر لـۆمەی مەکە و، ئەگەر بەسـەر دوژمنـدا سـەرکەوتیت و توانیـت چۆکی پێ دابدەیت؛ ئەوا شوکرانەبژێریی خودا بەجێبێنە.

- کوڕی خۆشەویستم؛ ئەوە بزانە خراپترین کەس ئەو کەسەیە کە لە گوناهی خەڵک خۆش نابێت و، هەڵەی خەڵک پشتگوێ ناخات هەروەها لەویش خراپتر ئەو کەسەیە کە خەڵک لە دەستی و زمانی ئاسوودە نەبن و، هیچ هیوایەکیان بە چاکە و میهرەبانی ئەو نەبێت. کوڕم کینەی هیچ کەسێکت لە دڵدا نەبێت، چونکە دەبێت بە هۆی ئەوەی ئارامی و ئاسوودەیی ڕۆح و جەستەت لەناو بچێت و، ئەوەش بزانە هەر کەسێک تۆڵە بکاتەوە تەنیا ڕۆژێک دڵخۆشە، بەڵام کەسێک کە لێبوردەیە بە درێژایی تەمەنی دڵخۆشە.

- کوڕی ئازیزم؛ ئەگەر دەتەوێت خەڵک بە بینینت دڵخۆش بن دەبێت تۆیش دڵخۆشی خۆت لە بینینیان دەرببڕیت و، هەمیشە هەوڵ بدەیت لە شەڕەقسە و مشتومڕ خۆت بەدوور بگریت، وەک چۆن لە مار و زەمینلەرزە هەڵدێیت. باشترین خەڵک ئەو کەسانەن کە ئەگەر ستایشیان بکەیت شەرمەزار ببن و، ئەگەر بەرامبەریان خراپەت کرد بێدەنگی هەڵبژێرن. ئەو بێدەنگییەی ئەوان هێمای گەورەییانە. کەواتە لەگەڵ خەڵکی چاک و دروستکار هاوڕێیەتی بکە تاکو تۆش یەکێک بیت لەوان.

- کوڕم؛ دڵنیابە هەڵسوکەوت و کردەوەی چاکیش دەتوانرێت بگوازرێتەوە، بەڵام پێویستی بە پشوودرێژییە. وەک چۆن نەخۆشی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوازرێتەوە، خراپە و خراپەکارییش توانای گواستنەوەیان هەیە بۆ خەڵک. کەواتە کوڕم هەوڵ بدە چاکەکاری و وتەی باشت بگوازرێتەوە بۆ خەڵکی تر. هەوڵ بدە لەگەڵ چاکەکاران هەڵسوکەوت بکەیت و هەڵسوکەوتی چاک و ڕاستی لەوانەوە بگوازرێتەوە بۆ تۆ، نەک هەڵسوکەوتی ناشیرینی خراپەکاران.

- کوڕی خۆشەویستم؛ هیچ ڕەفتارێک لە دروستی و هەڵسوکەوتی چاک و وتەی چاک جوانتر نییە، کەواتە هەوڵ بدە لە ڕێگای کردەوەی چاکەوە شادمان بیت، تاکو ئەو کەسانەی لەگەڵ تۆ هاوڕێ و هاونشینن ئاسوودە ببن، نەک ئەوەی لە ڕێگای تووڕەییەوە ڕەنج و نیگەرانی دروست بکەیت و، ساتەکان تاڵ و ناخۆش بکەیت بۆ هاوڕێیانت. هەوڵ بدە دوور بکەویتەوە لە هاونشینی لەگەڵ کەسانی ڕەزیل، چونکە ئەگەر پێویستت بە شتێک بێت بەجێتدەهێڵن و لێت دوور دەکەونەوە.

- کوڕم؛ هەتاکو پێت دەکرێت لەگەڵ کەسانی گەورە و پیاوچاک و لەخوداترس و میهرەباندا هاوڕێیەتی بکە؛ تاکو تۆیش سوود لە زانستیان وەربگریت و، لە ڕووناکی و تیشکی زانستی ئەوان نوورانی و گەورە ببیت، لەبیرت بێت کەس ناتوانێت بە تەنیایی هیچ سامانێک بەدەستبهێنێت و، دەبێت دڵێکی شوکرانەبژێر و میهرەبانت هەبێت و- تامەزرۆی دەستخۆشیکردن لەو کەسانە بیت کە یارمەتییان داویت. باشترین کەس ئەو کەسەیە کە سوود بە خەڵک دەگەیەنێت.

- کوڕەکەم؛ مرۆڤی گەورە ئەو کەسەیە کە بە وردییەکی زۆر و بە بیرکردنەوە و ئەندێشەوە دەژێت و ڕێگا بە خەم و نیگەرانییەکان نادات بێتە ناو ژیانیەوە، مەگەر ئەو خەم و مەراقەی ویستی خودایە. هەڵبەت کوڕم ئەگەر تۆ بەردەوام کاری چاک و زیکری خودا بکەیت دڵنیابە خودایش ڕێگای ژیانت لە خەم دەسڕێتەوە، هەروەها ژیان و ئارامییەکی باش هی ئەو کەسانەیە کە بە بیرکردنەوە و ئەندێشە و هەڵسوکەوتی باش و کردەوەی چاک و، بە ئارامی و پشوودرێژییەوە دەژین.

- کوڕی شیرینم؛ ژیان هێندە کورتە و هێندە زوو تێپەڕ دەبێت کە تەنانەت بواری ئەوەت نییە ئەزموونەکانت دووبارە بکەیتەوە، کەواتە بۆ سەرکەوتن لە ژیانت هەوڵ بدە لە ئەزموون و شکستەکانی خەڵک کەڵک وەربگریت، ژیانت کاتێک شیرین دەبێت کە بیرکردنەوە و ئەندێشە و کردارت و هەموو کار و قسەکانت دروست بێت و، خودا و خەڵک ڕازی بکات. ژیانت بەرهەمی ئەندێشە و بیرکردنەوەی تۆیە و، سادەترین وانەکانی ژیان ئەوانەن کە بە درێژایی تەمەن و ژیانت هەرگیز دڵی کەس لە تۆ نەیەشێت.

- کوڕی ئازیزم؛ هەوڵ بدە تا ئەو ڕادەیەی پێت دەکرێت و لە ئاستی ئەو شتانەی هەتە ژیانت بگوزەرێنیت و، هەمیشە ئەو کەسانەی شتی مەحاڵ و ناموەکینیان ویستووە ڕەنجیان بردووە و، هەمیشە سکاڵایان لە ژیان کردووە و، هەرگیز لە رووی دەروونییەوە ئاسوودە نەبوون، کەواتە هەوڵ بدە بەوەی هەتە ڕازی و قانع بیت.

- کوڕم؛ هەوڵ بدە هەر کەسێکت بینی بڕوانیت بۆ کردەوەی و، لە هزری خۆتدا سەرنجی قسەکانی بدەیت و شییان بکەیتەوە و، وەکو مامۆستایەک لێی بڕوانە و وانەی لێ فێرببە، ئەگەر قسە و کارەکانی لە پێش چاوت پەسەند نەبوو هەوڵ بدە تۆ ئەنجامیان نەدەیت؛ بەڵام ئەگەر کارەکانی باش و خوداپەسەند بوو هەوڵ بدە لەگەڵی ببیت بە هاوڕێ و کەڵک لە ئەزموون و قسەکانی وەربگریت، چونکە یارمەتی وەرگرتن لە بیری ئەو خۆی جۆرێکە کە قەناعەت و بەر بە زیانگرتن. دیسانەوە هەوڵ بدە لە بیری ئەودا بیربکەیتەوە.

- کورم؛ ئەگەر بە درێژایی تەمەنت بە بیر و ئەندێشەوە هەموو کارەکانت بکەیت، ڕۆژ بە ڕۆژ ژیان بۆ تۆ ئاسوودە دەبێت، ئەگەر لە ڕێگای بیرکردنەوە و زیکری خوداوە گەیشتیت بە نوورانییەتی ڕۆح و ئارامی، ئەوسا ژیانت پڕ دەبێت لە ڕووناکی و سۆز. ئەگەر ژیانت کورت بێت باشترە لەوەی سەد ساڵ بژیت و، ژیانت پڕ بێت لە گومڕایی و تاریکی.

- کوڕی خۆشەویستم؛ بە درێژایی تەمەن ژیان زۆر دژوارە، چونکە ژیان ڕۆژێک شیرین و ڕووناکە، ڕۆژێکیش تاڵ و تاریک. ئەو ڕۆژانەی تێیدا چاکەکاری و زیکری خودا دەکەیت لێوانلێو دەبن لە شادی و ئاسوودەیی، ئەو ڕۆژانەی دەکەویتە داوی تووڕەیی و داگیرکاری و ئیرەیی و چاوچنۆکی و تەماعەوە، پڕ دەبن لە تاریکی و ئازاری ویژدان. کەواتە هەوڵ بدە بە درێژایی تەمەنت بە زیکری خودا و چاکەکاری ژیانت پڕ بکەیت لە ئاسوودەیی.

- کورم؛ لە کێشەکانی ژیاندا ئەوە تەنیا خۆتی کە دەتوانیت پشت بە خودا ببەستیت و، بە وتنی زیکری خودا بیری خۆت کونترۆڵ بکەیت و، بیگەیەنیتە قۆناغی کردار، ئەوەش بزانە ئەو کەسانەی لە ژیانیاندا لە ڕووی ئابوورییەوە گەشەیان سەندووە بۆ دەستخستنی سامان چەندە تووشی زەحمەت و ڕەنج بوون و، بە چ ڕێگاگەلێکی پڕ مەترسییەوە تێپەڕیون. هەروەها ئەوەش بزانە سامانی ڕاستەقینە و حەڵاڵ ئەوەیە کە: یەکەم بۆ دەستهێنانی خۆت نەخەیتە مەترسییەوە و، دووەم ڕەزامەندی خودا لەبەرچاو بگریت. کۆکردنەوەی سامان ئەگەر لە ڕێگای حەڵاڵەوە نەبێت بێبایەخە.

- کوڕی خۆم؛ مردن سات و حاڵەتێکە زۆر لە خەو دەچێت، بەڵام خەونێکی قووڵ کە تۆ بۆ گواستنەوە لە ژیانی زەوی بۆ ژیانی دوای مردن، واتە ژیانی جەستەیی بۆ ژیانی ڕۆحی پێویستت پێیەتی، کەواتە هەوڵ بدە. هەروەها ئەگەر لە ژیانی کۆنی زەمینی بەردەوام زیکری خودا و کردەوەی چاکت کردبێت پاکژدەبیتەوە و، سەر لە نوێ لە دایک دەبیتەوە و، دڵخۆش و نوورانی دەژیت. بەڵام ئەگەر لە گومڕایی و بێبڕواییدا بژیت هاوار لە ژیانی دوای مردنەکەت.

- کوڕەکەم؛ لەم دنیا فانییەدا بە درێژایی تەمەنت ناتوانیت لە سات بە ساتی ژیانت هەڵبێیت دەبێت لە هەر چرکەیەکتدا وەها بژیت وەک بڵێیت چرکەیەکی تر بوونی نییە، کەواتە کوڕی خۆم؛ کاتەکانی ژیانت لە مشتومڕی بێهوودە و شەڕەقسە و ئازاردەر و شەڕ بەفیڕۆمەدە و، ژیان بە بیرکردنەوە و ئەندێشە و بە گوتنی زیکری خودا و چاکەکارییەوە دیارییەکی ناوازەیە بۆ نوورانیکردنی ڕۆح.

- کوڕەکەم؛ بەر لەوەی تەمەنت کۆتایی پێ بێت و بەر لە مردن بە وردییەوە بیر بکەوە و، تێبگە ئامانج لە ئافراندنی تۆ چی بووە، چونکە ئەگەر بەر لە مردن نرخی ساتەکانی تەمەن و ژیانت بزانیت و، سەرقاڵی چاکەکاری و زیکری خودا بوویت دڵنیابە عەزابی ترسناکی قەبر لێت دووردەکەوێتەوە، ئەو کاتە تۆ بە ئاسوودەیی دنیا بەجێدەهێڵیت.

- کوڕم؛ مردن و کۆتایی هاتنی ژیان له گوڵێکی سوور دەچێت که له بەرەبەیانــدا دەپشــکوێت و، دەســت به ژیــان دەکــات و، له خۆرئاوابووندا پەڕەکانی هەڵدەورن و شنەی با لەگەڵ خۆیدا دەیانبات و، دیسـانەوه دەکەونه سـەر زەوی و، دەبـن به خـاک. هەڵـوەرینی پەڕەی گوڵ به مانای ئەوه نییه که گوڵێک بوونی نەبووه و، به ڕاستی هەر نەبـووه، بەڵکو بەم ئەنجامه دەگەین که هەر چەشـنه جـوانی و گەشـییەک مـردن و تەواو بوونێکیشـی بەدواوەیه. کەواته کـوڕم؛ ئەوه بزانه تەمەنی تۆیش ڕۆژێک کۆتایی پێ دێت، بۆیه کوڕی خۆم؛ هەوڵ بده چاکه بکەیت و، سەرقاڵی زیکری خودا بیت، چونکه تەمەنـی تۆش وەکو سـوورەگوڵ خێرا کۆتـایی پـێ دێـت و، ڕۆحـت له دنیـای دوای مــردن درێــژه به ژیـانی خــۆی دەدات. هەروەهــا جەســتەت بــۆ گەشـەپێدانی ڕۆحـت دەبێـت له ژیـانی زەمینیـدا که پـڕه له ڕووداو و بەسـەرهات و کێشـه بەرگەی هەمـوو سـەختییەکان بگرێت، بەڵام تـاقه ڕێگــای ژیــان، ژیــان و ڕووبەڕووبــوونەوەیه لەگەڵ مەترســی و بەســەرهاتی جۆراوجـۆر. کەواته له ڕێگـای گـوتنی زیکـری خـوادا، پشوودرێژ به و، پشت به خودا ببەسته.

- کـوڕی خـۆم؛ مـردن و کۆتاییهـاتنی ژیـانی زەمینـی درێژتـر و هەتاهەتایی تره له ژیانی سـەر زەوی. دواجـار له تەمەنـی حەفتـا یـان هەشتا ساڵی یان زیاتردا ژیانت کۆتایی پێدێت و، ژیانی هەتاهەتـایی و هەمیشـەیی له دوای مـردنەوه دەسـت پـێ دەکـات و، کەسـانێک دوای مــردن دەکەونه ئــارامی و ئاســوودەیی هەتاهەتــایی و چێــژه هەمیشەییەکان که له دنیای زەمینیدا خەریکی چاکەکاری و ستایشـی خـودا بـووبێتن، کەواته هەوڵ بـده له دنیـای دوای مـردن بکەویـته ئارامییەوه.

- کوڕەکەم؛ ژیان لە دنیای زەمینیدا باشترین نیعمەتێکە کە جەستە دەتوانێت لە ڕێگای کردەوەی چاک و زیکری خودا و دووری لە خووە شەیتانییەکان، ڕۆح نوورانی و بەهێز بکاتەوە و، دنیای دوای مردن بخاتە ژێر نووری خودا و ئاسوودەییەوە و، کۆتایی ژیان و مردن بۆ ئەو کەسانەی چاکەکارییان کردووە و، زۆر زیکری خودایان کردووە زۆر بەچێژترە لە ژیانی زەمینی. کەواتە کوڕم هەوڵ بدە جۆرێک هەڵسوکەوت بکەیت کە تامەزرۆی مردن بیت نەک لێی هەڵبێیت.

- کوڕم؛ ئەوە بزانە مەرگی هاوڕێ و خزم و کەسانت دەتوانێت ئاگادارت بکاتەوە و، تۆ لەوە تێبگەینێت کە ژیان کورتە و، دواجار هەر کۆتایی پێدێت، دەبێت تۆ بە باشترین شێوە کەڵکی لێوەربگریت، هەڵبەت ئەوەی کە دەڵێم بە باشترین شێوە واتە وەها بژی کە دوای مردنت ڕۆحت لە ئاسوودەیی و چێژدا بێت، کە بێگومان ئارامیی ڕۆح تەنیا لە ڕێگای چاکەکاری و گوتنی زیکری خودا و، ئارامی و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خودا دەبێت.

- کوڕی ئازیزم؛ هەوڵ بدە بە درێژایی هەموو ژیانت وەکو دارێکی بە بەرهەم بیت کە لە پاییزی ژیاندا بە زەبرێک و پێداکێشانێک میوەی بەچێژ و پێگەیشتوو وەکو باران لێی دەوەرێت و، دەبێت تۆش وەها بژیت کە دوای مردنت هەزاران باشی و چاکەکاری لە دوای تۆ بە یادگاری بمێنێتەوە، گەورەیی و مەزنی مرۆڤەکان لە دنیای دوای مردن بە پێی کردەوە و بیری ئەوان ئەژمار دەکرێت؛ نەک لە ڕووی ماوەی ئەو تەمەنەی ژیاون.

- کوڕی خۆم؛ ئەگەر مرۆڤەکان دەیانزانی کەسی گوناهبار دوای مردن چەند پەشیمانە و، بە ئاواتی گەڕانەوە و قەرەبووکردنەوەی ڕابردوویەتی؛ ئیتر تێدەگەیشتن کە قەدری ئەو ڕۆژانەی بێ زیکری خودا و بێ چاکەکاری و، بە خەم و تووڕەیی و کردەوەی خراپ بەڕێیان کردووە چەندە گەورەیە. چونکە هیچ کەسێک نە دەتوانێت بۆ لەدایکبوونی خۆی شادی بکات لەبەر ئەوەی منداڵ و لاواز بووە و، نە دەشتوانێت بۆ مردنەکەی تازییە بگێڕێت، چونکە دیسان توانای هیچ کارێکی نییە. کەواتە دەبێت هەوڵ بدات لە ڕۆژانی گەنجی و بەهێزیی جەستەییدا سەرقاڵی چاکەکاری و زیکری خودا بێت و، عیبادەتی خودای گەورە بکات، تاکو هەموو ڕۆژێکی لەدایکبوونێکی تازە و ئاسوودەییەکی گەورە بێت و، دوای مردنیش ڕۆحی باڵا و نوورانی و سەرفراز و ئازا و بەهێز بێت و، ئینشاڵڵا لە بەهەشتی جاویداندا دەژی، هەڵبەت بەو مەرجەی بە درێژایی تەمەنی هەموو ڕۆژێک کردەوەی چاک بکات و سەرقاڵی زیکری خودا بێت.

- کوڕی خۆم؛ ئەوە بزانە زەوی پڕە لە کەسانی بێسوود و خراپەکار و بێنرخ، کە بوونی ئەوان لە زەویدا دەبێتە هۆی عەزابی هەموو بوونەوەرەکان. بەڵام سەرەڕای هەموو کارە نەشیاوەکانیان خودا تەمەنیان درێژ دەکات بۆ ئەوەی تۆبە بکەن و بچنەوە بۆ لای چاکە. کوڕم تۆ هەوڵ بدە ئەگەر ڕووبەڕووی ئەم کەسانە بوویتەوە لەگەڵیان بە هێمنی و باشی مامەڵە بکەیت، بەڵکو بە هۆی تۆوە هیدایەت و ڕێنوێنی بکرێن.

- کوڕەکەم؛ پایەبەرزیی مرۆڤەکان و عیبادەت و زیکری خودا ئەرکی سەرشانی مرۆڤەکانە و، بێ چاکەکاری و زیکری خودا ژیان هیچ مانایەکی نابێت. کەواتە هەر کەسێک دەبێت بە جۆرێک لەم ئەرکانە تێبگات. خودا تەمەنی درێژ بە مرۆڤەکان دەبەخشێت بۆ ئەوەی لە ئافرێنراوەکانی خودا وردببنەوە و، بیری لێ بکەنەوە و ڕۆحیان گەشە بستێنێت و، بەهێز بێت. هاوار لە ژیانی دوای مردنی ئەو کەسانەی بە درێژایی تەمەنیان ژیان و ڕۆژەکانی تەمەنیان لە ڕێگای خراپەکاری و کوفردا تێپەڕاندووە.

- کوڕی ئازیزم؛ تا کاتێک دیل و گرفتار نەبیت هەرگیز لە مانای ئازادی تێناگەیت، تا کاتێکیش هەستت بە تینوویەتی نەکردبێت لە مانای پاراوبوون تێناگەیت. کەواتە هەوڵ بدە لەم دنیا فانی و کاتییەدا و بە درێژایی تەمەنت چاکەی زۆر و میهرەبانی و زیکری خودا بکە، تاکو دوای مردن ڕۆحت دیل و گرفتار نەبێت و، تووشی تینوویەتی و برسییەتی نەبێت.

- کوڕی شیرینم؛ ئەوە بزانە قەفەز هەرچی تەسکتر بێت شیرینتر دەبێت، کەواتە تۆ لەم حاڵەتانە ئەزموون وەربگرە و، بزانە هەرچی زمانت لەناو زارتدا زیندانی بکەیت و، لە کۆڕە بێهۆدەکان دووربکەویتەوە و، تەنانەت ئەگەر پێویستی کرد خۆت لە ژوورێکدا زیندانی بکەیت ئەو کاتەیە تۆ دەست دەکەیت بە زیکری خودا و ڕۆحت پاک و خاوێن دەمێنێت و، لە ڕێگای بەندکردنی جەستە و زمانتەوە دەتوانیت وا لە ڕۆحت بکەیت بفڕێت و، لە ئاسماندا تامی شیرینی ئازادی بچێژێت.

- کورِم؛ پیرۆزترین حاڵەتەکان بۆ مرۆڤ تەندرووستی ڕۆحە و تەندرووستی ڕۆحیش لە ڕێگای چاکەکاری و زیکری خودا و، بیرکردنەوە بەر لە ئەنجامدانی هەموو کارێک بەدیدێت. لە ڕاستیدا ژیان و چێژبینین لە ژیان ئەوەیە کە ڕۆح لە ئارامیدا بێت، کاتێک بە کردنی کاری نەشیاو چێژ بە جەستە بگەیەنیت دوای ئەوە ڕۆحت لێڵ و تاریک دەبێت. کاتێکیش ڕۆح تاریک بوو، ئەوسا دوای ماوەیەک جەستە هەموو جۆرە ئازارێک دەچێژێت و، ئارامی جەستە بە تەواوی لەناو دەچێت.

- کوڕی خۆم ئاگاداربە! لەگەڵ کەسانی حەسوود و ڕق لە دڵ هاوڕێیەتی مەکە، چونکە کەسانی حەسوود تەنانەت ئیرەیی بە خۆیشیان دەبەن و، هەرگیز ئاسوودە نین و، بە شەرەفەوە ناژین و، بەردەوام ناخیان لێوانلێوە لە ڕق و کینە و، تا کۆتایی تەمەنیان لەگەڵ خۆیان لە شەڕ و کێشەدان و، دواجار بە ڕق لە دڵی دەمرن. ئیرەیی تیر بۆ لای خەڵک دەهاوێژێت، بەڵام دواجار ئیرەیی خاوەنی ئیرەیی واتە کەسی حەسوود بریندار دەکات.

- کوڕەکەم؛ ئەوە بزانە لە ئیرەیی و خۆبەزلزانیدا چاکە لەناو دەچێت. وەک چۆن شێ دەبێتە هۆی لەناوچوونی ئاسن؛ ئیرەییش دەبێتە هۆی لەناوچوونی چاکە و سۆز و چاکەکاری و، هەوڵ بدە لەگەڵ کەسی ڕاستگۆ و ڕاستیزان ببیت بە هاوڕێ. هەمیشە ڕاستییەکی تاڵ باشترە لە درۆیەکی شیرین و فریو و فێڵبازی. هەمیشە کەیفت بە ڕاستی بێت تەنانەت ئەگەر بە زیانیشت بێت.

- کـوڕی خۆشەویسـتم؛ هەوڵ بـدە تـووڕەیی و غەزەب وات لـێ نەکـات سـتەم لە خەڵـک بکەیـت و، تەنیـا هەوڵ بـدە و تـووڕەیی و غەزەبـت بـۆ وریـاکردنەوەی بەرامـبەرەکەت لە هەڵەیەک بێـت کە کردوویەتـی، نەک وا لە خـۆت بکەیـت تـووڕەیی و غەزەب ڕۆح و جەسـتەت ئـازار بـدات. ئەوەش بـزانە گەورەتـرین دەرمـان بـۆ کـونترۆڵکردنی تـووڕەیی و غەزەب سـەبر و بیرکـردنەوەیە، کاتێـک تووڕە دەبیت شەیتان لە ناختدا دەردەکەوێت و، بوونی شەیتان ئاگرە و هەوڵ بدە بە شوشتنی دەست و دەموچاوت (دەستنوێژگرتن) ئەو ئاگرە بکوژێنیتەوە و، شەیتان لە خۆت دووربخەیتەوە.

- کـوڕم؛ هەوڵ بـدە هەمیشـە لەگەڵ کەسـانی بەشـەرەف ببیـت بە هـاوڕێ، بەشـەرەف بە کەسـێک دەڵـێن کە هەمیشـە بیـرکەرەوە و بەئەدەبە و، هـیچ پەیوەنـدییەکی بە سـامان و دارایـیەوە نیـیە. ئەوەش بزانە مرۆڤ هەر چەند لە ڕووی پلە و پایەوە ئاستی بەرزتر بێت پتـر مەترسـی بێنرخـی لەسـەرە؛ کەواتە هەوڵ بـدە لە هەمـوو کارەکانتـدا وردبـین و چاکەکـار بیـت، چـونکە تۆزقاڵێـک نادروسـتی سـووک و پەستت دەکات.

- کوڕەکەم؛ مانای ژیان لە سەر گۆی زەوی بە مانای کۆتایی هاتن بە ژیانە، بەڵام جار جار ئەم تەمەنە درێژ دەبێتەوە و، هەندێ جاریش زوو تێپەڕدەبێـت. کەواتە هەوڵ بـدە تەمەنـت هەرچەنـدە بـوو بە باشترین شێوە کەڵکی لێوەربگریت و، تەمەنی خۆت لە ڕێگای چاکە و چاکەکاری و زیکری خودا تێپەڕێنیت و بگەیتە کۆتایی. بەڵام تەمەنی درێژ بێ چاکەکاری و بێ ناسین و زیکری خودا جگە لە عەزاب و تاریکی و گومراییەک هیچی تر نییە.

- کوڕی خۆم؛ پەروەردەکردنی رۆح و جوان و نوورانیکردنی لە ڕێگای زیکری خودا و چاکەکارییەوە؛ لە گەورەترین سەرکەوتنەکانی ژیانە و، ئەو کەسانەی ڕۆحێکی گەورەیان هەیە هەمیشە لێبوردە و میهرەبانن و، گاڵتە و دژایەتیکردنی خەڵکی نەزان و جاهیل پشتگوێ دەخەن و، لەگەڵ کەسانی نەزانیش میهرەبان و پشوودرێژن و، بەردەوام هەوڵ دەدەن لە بێدەنگیدا سەرقاڵی زیکری خودا بن.

- کوڕی شیرینم؛ هەوڵ بدە دووربکەویتەوە لە بێزاری و لۆمەکردن و تووڕەیی و تۆڵە و کینە و نەفرەت و ئیرەیی بەرامبەر بە خەڵک، چونکە ئەم کارانە دەبن بە هۆی لێڵ و تاریکبوون و پووکانەوەی ڕۆح و، تاریکی و پووکانەوەی ڕۆح دەبێتە هۆی ئازاری جەستەش، کاتی جەستە و ڕۆحت لە عەزابدا بوو؛ ئەوسا ئیتر تەمەنت کورت و بێبەرەکەت دەبێت. (جەڵتەی دڵ).

- کوڕەکەم، هەوڵ بدە لە ئەزموونی خەڵک فێری شت بیت؛ تاکو لەم ڕێگایەوە عەقڵت گەشە بکات و، لە هەموو کارەکانتدا سەرکەوتوو بیت. هەروەها هەوڵ بدە وەکو ئاسمان گەورە بیت، چونکە ئاسمان هەموو چەشنە ئەستێرە و هەسارەیەک لەناو خۆیدا جێدەکاتەوە. کەواتە کوڕی خۆم هەوڵ بدە هەموو چەشنە ئەزموونێک و هەموو جۆرە زانستێک لەناو مێشکی خۆتدا جێگە بکەیتەوە؛ تاکو لەم ڕێگایەوە وەکو ئاسمان گەورە و بە بەرەکەت و زوڵاڵ و خۆشەویست بیت.

- کوڕی خۆم؛ ئەوە بزانە کە تۆ دەتوانیت لە ڕێگای بیرکردنەوەوە سەبارەت بە ئافراندن و بوونی هەموو بوونەوەرەکان پەی بە وجوودی خودا ببەیت و، خودا لە ڕێگای زانست و هێز و ئافراندن و بەخشینی ژیان بە هەموو بوونەوەرەکان بوونی خۆی سەلماندووە و، لە ڕێگای بەخشینی ژیان بە هەموو بوونەوەرەکان نووری ژیانبەخشی خۆی ناردووە بۆ هەموو ئافرێنراوەکانی، بەڵام دەرکەوتنی نووری خودا لە ناخی ئەو مرۆڤانەی چاکەکاربوون و عیبادەتی خودایان دەکرد؛ زیاترە. کەواتە کوڕی خۆم؛ مرۆڤەکان بە هۆی ئەو ئەرکانەی بە درێژایی تەمەنیان لەسەر شانیانە ئەرکیان لە هەموو بوونەوەرەکانی تر گرنگترە، کەواتە کوڕم؛ ئەوە بزانە نووری ژیانبەخشی خودایە کە هەموو بوونەوەرەکانی خوڵقاندووە و، ئەوەش بزانە کە خودا تەنیا ئیلهامبەخشی بیرە چاک و خێرەکانە. هەروەها کوڕم؛ ئەگەر تۆیش کەڵک لەم فکرە چاک و خێرانە وەربگریت خودا فریشتەکان دەنێرێت بۆ هاوکاری و ڕێنوێنیت. لە جیهاندا هیچ راستییەک لەمە بالاتر نییە کە بڵێین زیکری خودا و سۆز و چاکەکاری دەبێتە مایەی بەرەکەت و ئارامی. واتە لە هەر شوێنێک میهرەبانی و چاکەکاری و زیکری خودا هەبێت؛ لەوێ سەرنج و ڕەحمەتی خوداش هەیە.

- کورم وریا به! له کاتی هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانت پەله نەکەیت و، بۆ دۆزینەوەی هاوسەری چاک سەرەتا دەبێت له خودا داوا بکەیت، دووەمیش دەبێت زۆر ورد بیت و به جوانی بیناسیت. هەروەها هەوڵ بده ژنێک هەڵبژێریت که داوێنپاک و چاکەکار و قانع و بەحیجاب و فەرمانبەر بێت و، هاوسەری ژیر و خواناس ژنێکه که له کاتی هەژاریدا له مێردەکەی تێبگات و، ئارامی و هێزی پێ ببەخشێت؛ تاکو بیری مێردەکەی بگاتە ئارامی و، به بیرکردنەوەی باش بەسەر کێشەکاندا زاڵ بێت و، ژیان و داهاتوویەکی باش دروست بکات.

- کوڕی شیرینم؛ ئەوه بزانه هەر کاتێک دوور کەوتیتەوه له میهرەبانی و چاکەکاری بەرامبەر به مرۆڤەکان، یان بوونەوەرەکانی تر، بۆ هەر هەنگاوێکی که له خودا دوور دەکەویتەوه و تەنانەت ئەو کاتەی تووڕه دەبیت و، ئەگەر تووڕەییەکەت وات لێبکات که تۆ چاکه و میهرەبانی و زیکری خودا لەبیر بکەیت؛ ئەو تووڕەییه تۆ له خودا دوور دەخاتەوه. کەواته کوڕم؛ ئەوه بزانه له ناختدا هێزی خودایی هەیه، کەواته کەڵکی لێ وەربگره و، له ڕێگای بیرکردنەوه و زیکری خودا و چاکەکاری پەی بەو ڕاستییانه دەبەیت که له ناخی تۆدان. کەواته ئەگەر بتەوێت دەسەڵاتی خودا بناسیت؛ دەبێت بیر له ئافراندنی هەموو ئەو بوونەوەرانه بکەیتەوه که له تەنیشتی تۆدان. به هەموو بوونتەوه ستایش و عیبادەتی خودا بکه.

- کـورِم؛ئەوە بـزانە کە تەنیـا لە ڕێگـای چاکەکـاری و زیکـری خـوداوەیە کە ڕۆحـی مرۆڤەکـان بەهێزتـر دەبێـتەوە و، خـوداش لە ڕێگای ئەو چیکەکاری و زیکرەوە دوعاکەتان بەدیدەهێنێت؛ کەواتە لە بەرژەوەنـدی هەمـوو مرۆڤەکـانە کە لە ڕێگـای نـوێژکردن و دوعـا (زیکـری خـودا) و چاکەکـارییەوە؛ ڕۆحـی خۆیـان بە نـووری خـودا نـوورانی و بـالاَ و بەهێـز بـکەن. کەواتە لە ڕێگـای بیرکـردنەوە لە سروشـت لە توانـای خـودا تێبگە و دڵنیـابە کە خـودا لەگەڵ هەمـوو کەسێک میهرەبانە و، وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە ناوی دەبەن و زیکری دەکەن.

- کورِەکەم؛ دنیا و ژیانی زەمینی وەکو قۆزاخەی پەپوولەیە، وەک چۆن پەپوولە لەناو قۆزاخەدا دەست دەکات بە گەشـەکردن و، دوای مـاوەیەک کامـڵ دەبێـت و لە قـۆزاخەکە دەردێـت و، لە (بـیچم)ی بوونەوەرێکی جوان دێتە ناو دنیایەکی گەورەوە؛ کە هەزار هێندەی قۆزاخەکەی ئەوە و، دەست دەکات بە فڕین و گەڕان و بینینی هەمـوو گوڵەکان و، هەموو شـوێنەکان. کەواتە کورِم هەوڵ بدە وەک پەروانە بیت.

- کورِی ئازیزم؛ ئەگەر ژیان لە گۆی زەوی و تێپەڕاندنی تەمەن بە بیرکردنەوە و ئەندێشەوە تێپەڕێت و، بەردەوام بە درێژایی تەمەن بیر لە ئافرێندراوەکانی خودا و، زیکری خودا بکەیتەوە؛ ژیانت زوو تێپەڕ دەبێت و، چێژبەخش و جوانیش دەبێت. دڵنیابە ئەو کەسانەی بیر لە دنیـای دوای مەرگ و جوانییەکـانی ئافرانـدن دەکەنەوە؛ هەم لەم دنیـا دەگەن بە ئاسوودەیی و، هەم دوای مردن دەگەنە هەموو جوانییەکانی خودا و، بە نیعمەتگەلێکی گەورە دەگەن.

- کوڕی خۆم؛ هەر لەو کاتەی مرۆڤەکان لەدایک دەبن ڕۆحیان بەردەوام موحتاجە بە زیکری خودا، چونکە خۆراکی ڕۆح زیکری خودایە. کەواتە باشتروایە جەستەت بەردەوام سەرقاڵی زیکری خودا بێت، تاکو رۆحت بەهێز بێت، بەڵام باشتریش ئەوەیە کە تۆ بە زیکری خودا و چاکەکاری هەوڵ بدەیت خەڵکیش بەرەو زیکری خودا و چن کەکاری ڕێنوێنی بکەیت؛ تاکو لەم ڕێگایەوە ڕۆحت زۆر گەشتر و بەهێزتر بێت.

- کوڕەکەم؛ هەوڵ بدە هەمیشە لە ڕێگای بێدەنگی و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خودا؛ خۆت نوورانی بکەیتەوە، تاکو لەم ڕێگایەوە ڕۆحت بگاتە ئاستێکی باڵا و لە ئاسمانەکاندا بفڕێت، بەڵام ئەگەر تۆ بە درێژایی تەمەن لەم دنیا فانییەدا کەسێکی بیرکەرەوە نەبیت و، بە کەمی زیکری خودا بکەیت؛ وەکو ئەو کاتەیە کە ڕۆحت تەنیا لە ئاسمانی زەوی و لەناو هەورەکاندا دەژی، ئەگەر ئاسمانی ژیانت هەوریيە لەبەر ئەوەیە کە ڕۆحت نەگەیشتووەتە ئاستێکی باڵا و، بە ڕادەی پێویست لە ڕێگای زیکری خودا و چاکەکارییەوە گەشەی نەکردووە، کەواتە هەوڵ بدە ڕۆژ بە ڕۆژ خەریکی وتنی زیکری خودا و چاکەکاری بیت، تاکو لەم ڕێگایەوە بگەیت بە ئاستێکی باڵا و، ڕۆحت لە ئاسمانەکاندا بفڕێت و، لە ئەنجامدا جەستەیشت بکەوێتە ئاسوودەییەوە. کەسێکیش کە بیر لە دنیای ئەبەدی دەکاتەوە؛ وەکو ڕۆحە باڵاکان هەمیشە لە ئاسوودەیی و نوورانییەتدایە و، هەمیشە دەکەوێتە ناو چێژێکی زۆرەوە کە بە وشە زەمینییەکان وەسف ناکرێت.

- کـــورِم؛ ئەوە بـــزانە مرۆڤەکـــان هەر کە کارێـــک دەکەن زۆر لەخۆبایی دەبن و، هەست بە ڕەزامەندی دەردەبڕن و، هەر هەلێکی بچووک وایان لێ دەکات لەخۆبایی بن و، بەردەوام بە خۆیان دەڵێن: مـن ئەم کـارەم بە ســەرکەوتووییەوە ئەنجـام دا و، زۆر خۆیـان هەڵدەکێشـن و، وەسـفی خۆیـان دەکەن و، سـەبارەت بە ئەو شارەزاییانەی لەو کارەدا بەکار هێنراوە قسە دەکەن و، بە کارامەیی خۆیانی دەزانن، بەڵام بۆ یەک چرکەش بیر لەوە ناکەنەوە کە ئەوە حزوور و ڕەحمەت و لوتفی خودا بوو هەنگاو بە هەنگاو ئەوانی ڕێنوێنی کردووە؛ تاکو بیر لە سەرکەوتنی خۆیان بکەنەوە و، ئەو سەرکەوتنە وانەی ئەندێشە و کەماڵیان بداتێ، نەک وایان لێ بکات لەخۆبایی ببن و، خودا لەبیر بکەن و، لە یادی خودا غافڵ ببن.

- کوڕی ئازیزم؛ کاتیک سەرقاڵی چاکەکاری و زیکری خودا دەبیت بینین و هاونشینی لەگەڵ تۆ بۆ خەڵک چێژبەخش دەبێت، لەبەر گوتنی زیکری خـودا و چاکەکـاری وجـوودی تـۆ زۆر سـەرنجڕاکێش و وزەبەخش دەبێت. هەر کەسێک چاوی بە تۆ بکەوێت هەر لە یەکەم چرکەسـاتی دیـدارتەوە شـاد دەبێـتەوە، لەو سـاتەدا هەسـت بە بەنرخترین هەست لە ناخی خۆیدا دەکات و، لەم ڕێگایەوە شاد و دڵخۆش دەبێت.

- کوڕی خۆشەویستم؛ ئەزموونی بێدەنگبوونی زیاتر و، قسەکردن لە کاتی پێویست و، زیکری خودا، دەبێتە هۆی گەشەی عەقڵی و هزری تۆ. هەروەها ئەگەر بڕوای تۆ بە عالەمی ئەبەدی سست و لاواز بوایە بە درێژایی تەمەنت بۆ ساتێکیش هەستت بە ئارامی و چێژبەخشی نەدەکرد؛ ئەوسا نەزانی و تاریکی هەموو گیانی داگیر دەکردیت و وەکو بوونەوەرێکی سەرگەردان و مات دەکەوتیتە ناو تاریکی ڕۆحییەوە و، لەو دنیا گرفتاری عەزابی ئیلاهی دەبوویت.

- کوڕی خۆم؛ سەرکەوتن لە هەر کارێکدا چ ئەو کارە بچووک بێت یان گەورە، ئەو سەرکەوتنە هی خودایە. ئەگەر تۆ وریا و ژیریت ئەمە باڵاترین دیاریی خودایە و، ئەگەر زیرەک و زرنگ و تێکۆشەریت ئەویش هەر ئەنجامی بەخششی خودایە و، ئەگەر تۆ بەرامبەر بە هەموو نیعمەتەکانی خودا شوکرانەبژێر بیت ئەو خاکیبوونەی تۆش لوتف و بەرەکەتی خودایە. کاتێک تۆ زانیت دەبێت بۆ هەموو نیعمەتەکانی خودا سوپاس و شوکرانەبژێریی خودا بەجێبهێنیت؛ ئەو کاتە گەیشتوویت بە پلەی تێگەیشتن و، هەموو نیعمەتێک حەڵاڵ و پاک دەبێت بۆت. کاتێک کە فێربوویت لە هەموو بارودۆخێکدا شوکرانەبژێریی خودا بەجێبهێنیت؛ ئەوکاتە بە فەرمانی خودا ڕزق و ڕۆزیی زۆرت بەرسەردا دەبارێت؛ کەواتە پشوودرێژبە و، هەر شتێکت دەوێت لە خودای داوا بکە.

- کورم وریا به! کاتێ ڕۆحت دەگاتە ئاستێکی باڵا؛ شەیتان لە ڕێگای هەڵپە و تەماع و ئیرەیی و پەلە و شەهوەتەوە دوات دەکەوێت. هەر بۆیە وریا به! شەیتان تا دوا ساتەکان و تا کاتی مردن بە شوێنتدا دێت، تاکو بتخاتە ناو ڕیزی گومڕاکانەوە، کەواتە ئەگەر لە قۆناغەکانی سەرەوە فریوی شەیتان نەخۆیت دەبیتە یەکێک لە خۆشەویستانی خودا.

- کوڕەکەم؛ مرۆڤەکان بە دوو چاو و یەک زمان لە دایک دەبن؛ تاکو دوو هێندەی ئەو شتەی دەیڵێن ببینن، بەڵام ئەگەر سەرنجی شێوازی ژیانیان بدەیت پێتوایە بە دوو زمان و چاوێکەوە لە دایکبوون، چونکە ئەو کەسانەی کەمتریان بینیوە پتر قسە دەکەن و، ئەوانەی هەرگیز هیچیان نەبینیوە سەبارەت بە هەموو شتێک بڕیار دەدەن و، ڕای خۆیان دەردەبڕن. کەواتە کوڕم تاکو شتێکت بە چاوی خۆت نەبینیوە بڕیاری لەسەر مەدە.

- کوڕم ئاگادار به! بە درێژایی تەمەنت لە هەموو کارەکاندا بە ئاگاهی و بڕوایەکی تەواو دادوەری بکەیت، بۆ نموونە سەبارەت بەو شتانەی نایبینیت زوو بڕیار مەدە و، هەوڵ بدە لە بڕیاردان سەبارەت بەو کارانەی نەتبینیون زۆر ورد ببیتەوە و، بگەیت بە دڵنیایی، تاکو لە ڕێگای لێکۆڵینەوە لە ڕاستی کارەکە تێبگەیت.

- کوڕی خۆشەویستم؛ ئەوە بزانە خودا بەندەکانی خۆی لە ڕێگای سەختییەکانەوە تاقی دەکاتەوە. وەک چۆن لە ڕێگای دژوارییەکانەوە حەزرەتی ئەیوبی تاقیکردەوە و، حەزرەتی ئەیوب بوو بە باشترین بەندەکانی خودا. چونکە لە سەختییەکاندا ئارام و خۆڕاگر بوو، هەروەها کوڕم؛ هەر کاتێک جەستەی مرۆڤ ئازار دەچێژێت گرنگیدانی ئەو بۆ ڕەنج و ئازارەکەی دەبێت بە هۆی ئەوەی بەر بە گوناهکردنی بگرێت و، ئیتر گوناە ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت، چونکە لەو کاتەدا بیر لە ئازارەکانی دەکاتەوە و، ئەم ئازار و ڕەنجە بەشێکە لە خزمەتێک کە خودا بە تۆی ڕاسپاردووە و، تۆ لەم دنیایەدا ڕێبوارێکیت و خانووی سەرەکیت لە دنیای دوای مردندایە، کەواتە هەوڵ بدە دووربکەوتنەوە لە چێژە بێهوە دنیاییەکان، ئەگەر ژیانێکی باشتان دەوێت دوور بکەوەرەوە لە قسەی خراپ و درۆ و خراپە و، لەگەڵ هەموو کەسێکدا بە چاکی هەڵسوکەوت بکە و، لەگەڵ هەموو کەسێک لە ئاشتی و تەباییدا بژی. دنیا زوو کۆتایی پێدێت، کەواتە هەوڵ بدە ئەندێشە و کردارت پاک بکەرەوە و، خۆڕاگربە؛ تاکو بتوانیت دوعا بکەیت و، لە هەمووی گرنگتر بە هەموو بوونتەوە بەرامبەر بە کەسانی تر میهرەبان بە، چونکە چاکە و میهرەبانی دەبێتە هۆی پاککردنەوەی گوناهەکان و، ئاوهاش لە بەرەکەت و لوتفی خودا بەهرەمەند دەبیت و، هەم لەم دنیا دەگەیت بە ئارامی و، هەم لە دنیای پاش مردنیش دەبیت بە یەکێک کەسە نزیکەکانی خودا.

- کوڕی شیرینم ڕوو وەرمەگێڕە لە خەڵک و بەنازو فیزەوە مەڕۆ بە سەر زەویدا، بەڕاستی خودا ئەو کەسانەی خۆشناوێت کە بەنازو فیزەوە بەسەر زەویدا دەڕۆن.

- کورم؛ سوپاس و شوکرانەبژێریی خودا بەنرخترین وانەی ژیان و، کامڵبوونی ڕۆحت پێ فێردەکات، بۆ ئەوەی بە ئاواتی شتی مەحاڵ نەبیت و، چێژببینیت لەو شتەی کە ئێستا هەتە و، سەرنجی ناخی خۆت بدەیت، کاتێک سەرنجی ناخی خۆت دا کامڵ دەبیت و، سەرت لە ناخی خۆت سووڕدەمێنێت. هەر بۆیە پشوودرێژی دەوێت؛ تاکو لە سەرسووڕهێنەریی ناخی خۆت تێبگەیت، هەڵبەت لە ڕێگای زیکری خوداوە.

- کوڕی خۆم؛ ئەوە بزانە دنیا گەورەیە و مرۆڤیش بچووک، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگای چاکەکاری و عیبادەت و گوتنی زیکری خودا وەها گەورە ببێتەوە کە جیهان لە ئاستیدا بچووک بێت، هەڵبەت بە چاکەکاری و زیکری خودا. کەواتە کوڕی خۆم داوات لێ دەکەم لە ڕێگای گوتنی زیکری خودا و کردەوەی چاک خۆت بگەیەنیتە ئاستێکی باڵا و خۆت نوورانی بکەیت، تاکو دوای مردن بەرەو ئاسمانەکان بفڕیت.

- کوڕی شیرینم نەکەی کەسێک یان شتێک بکەی بە هاوبەش و هاوتای خودا، چونکە بەڕاستی هاوتاو هاوبەش پەیدا کردن بۆ خودا ستەمێکی گەورەیە کەمرۆڤ لەخۆی دەکات.

- کوڕی ئازیزم بەڕاستی ئەگەر گوناهێک بە ئەندازەی تۆوی خەردەلەیەک هەبێت و لەناو بەردێک و لەناو ئاسمانەکان یان لەزەویدا حەشار درابێت، خودا دەیهێنێتەوە ڕێگەت، بەڕاستی خودا هیچ شتێکی لا شاراوا نیە و زۆریش ئاگادارە.

- کوڕی شیرینم نوێژەکانت بەچاکی ئەنجام بدە فەرمان بکە بەچاکە و ڕێگری بکە لە خراپە و ئارام بگرە لەبەرامبەر ئەو ناخۆشیانەی توشت دەبن، بەڕاستی ئەوانەی کە باسکران شتانێکن کە دەبێت هەر ئەنجام بدرێن.

- کوڕی شیرینم لەکاتی ڕۆشتندا مامناوەندی بڕۆ و بە دەنگی نزم قسە بکە.

- کوڕی خۆم ئامۆژگاریت ئەکەم بە دووشت کە دەستیان پێوە بگری:

یەکەم: پارە تا پێی بژیت.

دووەم: ئاین بۆ سەرفرازی ڕۆژی دوایت.

- کوڕی شیرینم بەهۆی کەسابەتی حەلاڵەوە خۆت لە هەژاری بپارێزە، چونکە هەر کەسێک هەژار بووبێت سێ شت توشی دەبێت، کورتی لەئاینەکەیدا و لاوازی لەئەقڵیدا و نەمانی پیاوەتی، لەو سیانەش گەورەتر خەڵک بە سوکی تەماشای دەکەن.

- کوڕی خۆم دانایی و حیکمەت هەژار دەکات بە پاشا، نەکەی قیناع بپۆشی بە شەو ترسناکە و بەڕۆژ بێزراوە.

- ئەی کوڕی شیرینم لەکارەکانتدا ڕاوێژ بە خاوەن ئەزموون و دنیا دیدەکان بکە، تا بیرو بۆچوونی خۆیانت بە خۆڕایی بدەنێ، کە خۆیان بە هەوڵ و ماندوو بوون دەستیان کەوتووە.

- ئەی کوڕی شیرینم هەر کەس لەتوانای خۆی زیاتر هەڵبگرێت پەکی دەکەوێت، هەرکەسێک بەخۆی بنازێت تیا ئەچێت، هەرکەسێک فیز بەسەر خەڵکیدا لێبدات خودا زەلیلی دەکات، هەرکەسێک بۆ کارەکانی ڕاوێژ نەکات پەشیمان دەبێتەوە، هەرکەسێک هاوەڵایەتی زانایان بکات زانیاری فێر دەبێت، هەرکەسێک کەم قسە بکات بێوەی دەبێت.

- کوڕی خۆم لەناو نوێژدا ئاگات لە دڵت بێت و لەناو خەڵکیدا ئاگات لە زمانت بێت، لەکاتی نانخواردندا ئاگات لە سکت بێت و لەکاتی میوانیدا ئاگات لە چاوت بێت.

- کوڕی شیرینم دوو شت با هەمیشە لە یادتت بێت خودا و مردن، دووشتیش هەمیشە لە یادیکە چاکەی خۆت بەرامبەر خەڵکی و خراپەی خەڵکی بەرامبەر خۆت.

- کوڕی خۆم بەبێ هۆ قسە مەکە، بە ئەدەبەوە بە ڕێدا بڕۆ، پرسیار لەشتێک مەکە کە پەیوەندی بەتۆوە نەبێت.

- کوڕی خۆم  ماڵ و سامانت بە فیڕۆ نەدەیت و ماڵی خەڵکی پێ چاک بکەی، ماڵ و سامانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە پێشی خۆتی بدەیت بۆ قیامەت.

- ئەی کوڕی خۆم لەسەر ئەژنۆ بچۆ بۆلای زانایان و بەدڵ گوێیان لێبگرە، بەڕاستی دڵ بەزانست ئەبوژێتەوە، هەروەک چۆن زەوی وشک بە بارانی پەڵە زیندوو دەبێتەوە.

- ئەی کوڕی خۆم کاتێک لەش ساغ بووی دڵخۆش مەبە و ناخۆشی و دڵتەنگی خۆت بشارەوە، ئەمە ئەوپەڕی خشڵ و چاکەیە ، ئارامبگرە لەسەریان بۆت دەبێت بە تێشوو لە دواڕۆژدا.

- کوڕەکەم بە کەم ڕازیبە، بە بەشی خۆت دڵگران مەبە و چاوت لەدەستی خەڵکی نەبێت، چونکە ئازارت دەدات و هیچت دەست ناکەوێت.

- کوڕی شیرینم با گوناهەکانت لەبەرچاو بێت تا مردن، بەڵام با چاکەکانت لەبەر چاونەبێت ،چونکە کەسێک لای خۆی تۆماری کردوە کە هەرگیز لە یادی ناچێت.

- کوڕی شیرینم ئەگەر ئارەزوو زاڵ بوو بەسەر هەر کەسێکدا ئەوا دڵی تاریک دەکات، ئەگەر دڵی تاریک بوو ئەوا سلک و دەرونی گرژ دەبێت.

- کوڕی خۆم هەرکەس کەم قسە بکات بێوەی ئەبێت، هەرکەس وتەی چاک بێت بێوەی ئەبێت، هەرکەس قسەی پڕوپوچ بکات تاوانبار دەبێت، هەرکاس خاوەنی زمانی خۆی نەبێت پەشیمان دەبێت.

- ئەی کوڕی خۆم فەرمان مەکە بەچاکە و خۆت لە یادی بکەی، ئەگەر وابکەی تۆ وەک ئەو کەسە وایت کە چرایەکی پێبێت ڕووناکی بۆخەڵکی بێت و خۆی بسوتێنێت.

- کوڕی خۆم من ئاسن و پۆڵام زۆر هەڵگرتوە بەلامەوە زۆر قورس بووە، بەڵام هیچی بەلامەوە لە هاوسێی خراپ قورستر نەبووە ، ناخۆشی زۆریشم بینیوە بەڵام هیچی لە هەژاری ناخۆشتر نەبووە.

- کوڕەکەم بینایی چاوم نەکەی درۆ بکەی زمانت لە درۆکردن بپارێزە، چونکە ئەوەی درۆ بکات شەرم وئابڕووی ئەتکێت و سەنگی نامێنێت و لای خەڵکی متمانە لەدەست ئەدات.

- ڕۆڵەکەم ئەوەی بەدڕەوشت و خراپەکار بێت تەنگ و چەڵەمە و خەفەتی زۆر دەبێت و هەمیشە دڵی خەمبار دەبێت.

- کوڕی خۆم دڵخۆش مەبە بە کردەوەکانت ئەگەرچی زۆریش بێت، چونکە تۆ نازانی ئایا خودای گەورە لێی وەرگرتوی یان نا.

- ڕۆڵە گیان هەڵگرتنی بەرد ئاسانترە لە تێگەیاندنی پیاوی نەفام و تێنەگەیشتوو.

- ڕۆڵەکەمْ جگەرگۆشـەکەم ئەوەندە لە خـودا بترسـە کە لە بەزەیـی خـۆی نـا ئومێـد و بـێ نیـازت نەکـات، ئەوەنـدەش لە خـودای گەورە دڵنیابە کە جورئەتی گوناە کردنت پێنەدات.

- کوڕی خـۆم سـێ کەس هەن لە سـێ بـواردا نەبێت تاقینـاکرێنەوە، پیـاوی ئـارامگر لە کـاتی تورەیـدا دەرەکەوێـت ، پیـاوی ئـازا لەکـاتی شەڕدا دەرەکەوێت، هاوڕێ لەکاتی پێویستی و تەنگانەدا دەرەکەوێت.

- ڕۆڵە گیان ڕۆشنایی دیدەکانم هێزی ئەژنۆ و بڕبڕەی پشـتم تـاڵی و سـوێری زۆرم چەشـتووە، بەڵام بەخـودا لە هەژاری تـاڵترم نە چەشتووە.

- ئەی کوڕی شیرینم کاتێک چوویتە ناو کۆڕ و کۆمەڵێکەوە، تیـری سەلامیان تێبگرە سـەلامیان لێبکە، پاشـان لەسـوچێکەوە دابنیشـە قسـە نەکەی تا ئەوان دەست دەکەن بە قسـەکردن ، ئەگەر قسـەکانیان بـاش بوو ئەوا تۆش بەشداربە لەگەڵیان، بەڵام ئەگەر قسەکانیان خراپ بـوو ئەوا هەستە و ئەو جۆرە کۆڕ و کۆمەڵە بەجێبهێڵە.

- ڕۆڵە گیان لەماوەی تەمەنی ڕابردومدا ئەوە فێربووم و دڵنیابووم کە خودای گەورە هەر بەڵاو تاقیکردنەوەیەک کە ڕووبەڕوی بەندەیەکی دەکاتەوە، ئەوا خێرێکی تێدایە یان بەڵایەکی گەورەتری پێ لادەبات، کورەکەی وتی باوکە گیان ڕێزێک زۆرم بۆ تەمەن و ئەزموون و پەندەکانت هەیە، بەڵام مـن هەرچـی ئەکەم مـن تێنـاگەم چـۆن ئەگەر توشی نارەحەتیەک ببم خێری تێدایە یان ئاخۆ ئەبێت چ بەڵایەک لەوە ناخۆشتربێت تا دڵمان بەوە خۆش بکەین کە خودای گەورە دوری خستۆتەوە لێمان !!! لوقمان ووتی: ڕۆڵە نازانم چۆن تێتبگەیەنم بەڵام بە هەرحـاڵ باشـترین چارەسـەر ئەوەیە لە فـلان شـار هەرچەنـدە دوریشـە یەکێک لەپێغەمبەرانی خـودا لەوێ بانگەواز بـۆ ئاینی خـودا دەکات وا باشە بچیت بۆلای ئەو پێغەمبەرە تا بۆمان ڕوونبکاتەوە و تێمانبگەیەنێت. کوڕەکەی ووتی: جا باوکە گیان تۆ لەگەڵم دێی بۆ ئەو شـارە دوورە، لوقمـان ووتـی: بەڵـێ چـۆن حەزدەکەی بـا وابێـت جگەرگۆشەکەم.

- لوقمان وکوڕەکەی خۆیان کۆکردەوە و ئامادەی سـەفەر بوون و تێشـووی پێویسـتیان ئـامەدە کـرد لە نـان و ئـاو و هەر یەکێکیـان ئەسـپێکی باشـی زینکـرد و کەوتـنە ڕێ بەڵام پـاش سـەفەرێکی چەن شەو و ڕۆژی کە بەتەواوەتی ماندوو بووبون بەهۆی بڕینی ئەو ڕێیە دووره سەختەوە کەچی هەر نەگەیشتنەجێ و لەوەش ناخوشتر بۆیان ئەوەبـوو کە ئاوەکەیـان تەواو بووبـو نانەکەشـیان زۆر کەمببـۆوە، گەرمـای زۆر مانـدووی کردبـوون و تینـوێتی زۆری بـۆ هێنـابوون، ئەسپەکانیان هـاتن بەچۆکداو چیتر نەیـان تـوانی هەڵیان بگرن، بۆیە ناچاربوون ئەسپەکانیان لەو دەشتە بەجێبهێڵن. ماوەیەکی زۆریش بە پێ ڕێیانکرد بەڵام حاڵیان زۆر شلۆق و نالەبار بوو.

له دوورەوە دوکەڵ و گەردەلولێکیـــان بەدی کـــرد، لوقمـــان بە کوڕەکەی ووت: ڕۆڵە ئەو دوکەڵە نیشانەی ئاوەدانیە پشتیوان بەخودا بەم نزیکـانە پێیـدەگەین، ئەوە شـارەکەیە کە باسـم کـرد، بەمشـێوەیە کەمێک هیوایـان هـاتەوە بەر و گوڕیـان تێهـاتەوەو کەوتـنەڕێ بەرەو شـارەکە، بەڵام ئێسـقانێکی زۆر تیـژ کە لەزەویەکەدا بەلاری کەوتبـوو چەقی بە پێی کوڕەکەی لوقماندا و لەسەری پێیەوە دەرچوو، ئەوەندە ئازاری هەبوو لەهۆش خۆی چوو، لەم کاتەدا لوقمـان وەک بـاوکێکی دڵسـۆز و بەسـۆز زۆر نـاڕەحەت بـوو بە ددان ئێسـقانەکەی لە پێـی کوڕەکەی دەرهێنا و پاشان پارچەیەک قوماشی لە مێزەرەکەی سەری کردەوە و قـاچی کوڕەکەی پێ پێچـاو سـەری کوڕەکەی خستەسـەر ڕانی و دەستیکرد بەگریان لەم کاتەدا چەند دڵۆپە فرمێسکێکی گەرم کەوتە سەر ڕومەتی کوڕەکەی بۆیە کوڕەکەی بە ئاگا هاتەوەو چاوی هەڵبڕی و بینی باوکی زۆر بێتاقەتە و دەگری ووتی: ئـای بـاوکە ئەوە تـۆی بێتـاقەت بوویـت و دەگریـت، مەگەر تـۆ نەتگـووت هەر بەڵاو نـاڕەحەتیەک بێـت بەسـەر مرۆڤـدا ئەوا خێـری تێـدایە یـان لەوانەیە خـودای گەورە بەڵایەکی تـری لـێ لابدات، ئێتـر تـۆ بـۆچی ئەگریـت و بێتاقەتی، باوکی ووتی: ڕۆڵەگیان بۆتۆ ئەگریم و خەفەت بۆتـۆ ئەخـۆم کە قاچـت توشـی ئەم ئـازارە بـووە، ئێسـتاش سـورم لەسـەر ئەم قەناعەتەی خۆم کە ئەم بەڵا و تاقیکردنەیە خێری تێدایە، لەوانەیە لە بەڵایەکی گەورەتـر ڕزگارمـان بووبێت، ئەوا شـارەکە نـزیکە و وردە وردە ئەڕۆین خودا گەورەیە ڕۆڵەگیان، با بکەوینەڕێ.

لەم کـاتەدا لوقمـان تەماشـی کـرد هـیچ نیشـانەیەکی ئـاوەدانی و دووکەڵـی بەدی نەکـرد سـەری سـوڕما و بە کـوڕەکەی ووت: ڕۆڵە بەخودا سەیرە خۆ هیچ شـتێک بەدی نـاکەم ئەوە چیە، لەم کاتەدا کە لوقمان و کوڕەکەی ئەبڵەق بووبون و نەیاندەزانی چی بە دی بکەن لە دوورەوە ئەسپسـوارێکیان بینـی کە زۆر بەخێرایـی غـاری دەکـرد و دەڕۆشت و جلێکی سەرتاپا سپی لەبەردا بوو، لەدوورەوە بانگی کرد

تۆ لوقمانی، لوقمان بەسەر سورمانێکەوە ووتی: بەڵێ من لوقمانم، ئەسپسوارەکە ووتی: کورەکەت چۆنە ئەوە باسی چی دەکات ؟ لوقمان ووتی: تۆ کێیت ؟ من تۆ ناناسم و ناتبینم ؟ ئەسپسوارەکە ووتی: من جوبرەئیلم، من تەنها پەیامبەرێکی گەورە یا فریشتەیەکی نزیک لە خودا نەبێت نامبینێت، ئەگەر وانەبوایە دەتبینیم، لوقمان ووتی: دەزانی کورەکەم باسی چی کردووە ؟ جوبرەئیل ووتی: نازانم کورەکەت باسی چی کردووە بەڵام من زۆر لە خودا پارامەوە کە بتانپارێزێ و نەگەنە ناو ئەم شارە، چونکە خودای گەورە منی نارد و ژێراو ژوور و وێرانم کرد، چونکە سەرپێچی پێغەمبەرەکەیان کرد.

لوقمان ووتی: باشە چۆن رزگارمان بوو ؟ جوبرەئیل ووتی: پارامەوەو داوام لە خودای گەورە کرد توشی شتێکتان بکات و بەهۆی ئەوەوە دوابکەون و نەچنە ناو شارەکە، ئەگەر نا ئێوەش وەکو خەڵکی ئەو شارەو دەوروبەری لەناو دەچوون، وادیارە برینداربوونی قاچی کورەکەت دوای خستوون و رزگارتان بوو، تۆش بەنیەتی شیفا دەست بێنە بە قاچی کورەکاتدا و ناوی خودا بەسەخواردن و خواردنەوەکان بخۆنەوە و خوداش بەرەکەتی تێدەکات و بگەرێنەوە بۆ شارەکەی خۆتان، جوبرەئیل ئەمەی ووت و لەبەرچاو وون بوو.

کورەکەی لوقمان ووتی: بەخوا باوکە سەیرە باش بوو تێکەڵ بە خەڵکی ئەو شارە نەبووین ئەگینا ئێمەش لەناو دەچووین، لوقمان ووتی: ئەها کوری خۆم بەچاوی خۆت بینیت و بو گوێی خۆت بیستت کە چۆن خودا بەزەیی پێماندا هاتەوە ،دەزانی ئەگەر مرۆڤ لەکاتی خۆشیدا خودای لەیاد بێت ئەوا لەکاتی ناخۆشیدا خودای گەورە یادی دەکات و بەهانایەوە دەچێت، خودای گەورە جڵەو شل دەکات بۆ ستەمکاران بەڵام لەیادیان ناکات و کە کاتی خۆی هات لەناویان دەبات، کورم ئەوە بزانە کە ئێمە مسوڵمانین و بەندەی خوداین دەبێت

ڕازی بین بە هەموو ئەو قەزاو قەدەرانەی کە خودای گەورە دەیهێنێتە ڕێگەمان، ئەوە هەمووی خێرە و پاداشتی لەسەر وەردەگرین، کوڕەکەی ووتی: باوکە گیان ئێستا ڕاستی قسەکانتم بۆ دەرکەوت و تێگەیشتم، پشت بە خودا لە قسەکانی تۆ دەرناچم.

- ڕۆڵەکەم دەزانی خراپترین کەس کێیە ؟ ئەو کەسەیە کە بەلایەوە گرنگ نیە خەڵک ناوزڕاو بێت و بە خراپی بزانن، ئاساییە بەلایەوە لەبەرچاوی خەڵک کاری خراپ ئەنجام بدات.

- کوڕەکەم کاری چاکە بکەو وریای خراپە بە، بەچاکە خراپە دەکوژێتەوە، ئەگەر ئەو قسەیە ڕاستە ئاگر لای ئاگر بکەرەوە و بزانە ئایا دەیکوژێنێتەوە، بەڵام خراپە بە چاکە دەکوژێتەوە، هەروەک چۆن ئاگر بە ئاو دەکوژێتەوە.

- کوڕەکەم بە کەم ڕازیبە و قەناعەتت بە بەشی خۆت هەبێت و چاوت لە ماڵی خەڵکی نەبێت، چونکە ئازارت ئەدات.

- کوڕەکەم زمان کلیلی چاکە و خراپەیە، تۆش مۆرێک لە زمانت بدە هەروەک چۆن مۆر لە زێڕ و زیو دەدەی، تەنها بۆ چاکە زمانت بەکار بهێنە.

- کوڕی خۆم سەربەرزی بۆ ئەوەیە کە دنیا سەری لێنەشێواند و لە خۆی بایی نەبوو تا لە ڕۆژی قیامەتدا پەشیمان ببێتەوە.

- ئەی کوڕی خۆم یەکەم شت کە بەکەڵکت بێت و ڕزگارت بکات لەدوای باوەڕ بەخودا هاوڕێی چاکە، بەڕاستی هاوڕێی چاک وەک دارخورما وایە، یا لە سێبەرەکەی دائەنیشیت یان لەبەرە شیرینەکەی ئەخۆیت یان سود لە لقەکانی وەردەگریت.

- کوڕی خۆم گوێڕایەڵی خودا وەک بازرگانی وەربگرە قازانجێکی زۆر دەکەیت بەبێ کەلوپەل لە خودا بترسە، با خەڵکی وا تەماشات نەکەن کە لە خودا ئەترسی تا ڕێزت لێبگرن و دڵیشت بێ ئاگابێت.

- کوڕی خۆم ئەوەندە ئومێدت بە خودا هەبێت کە لە سزای ئەمین نەبیت، ئەوەندەش لێی بترسە کە لەبەندەیی و ڕەحمەتی نا ئومێد نەبیت، ووتی: باوکە گیان من چۆن ئەوە بکەم لە حاڵێکدا کە من دڵێکم هەیە ؟ لوقمان ووتی: کوڕی خۆم بەڕاستی مرۆڤی باوەڕدار خاوەنی دوو دڵە، دڵێک کە ئومێدی بە خودایە، دڵێکیش کە ترسی لە خودایە.

- کوڕی شیرینم بەڕاستی نموونەی ئەوانەی یادی خودا ئەکەن و ئەوانەی یادی ناکەن، وەک ڕووناکی و تاریکی وایە.

- کوڕم ئاوات بەکەسێک مەخوازە کە خوێنی باوەڕداران دەڕێژێت، ئەو کەسە لای خودا بکوژێکی بۆ هەیە کە نامرێت.

- کوڕی خۆم بۆ ئەوە زانست فێرنەبیت کە خۆتی پیاپادەی بەسەر زانایاندا و دەمەقاڵێی پێبکەی لەگەڵ نەفاماندا و خۆتی پێدەربخەی لەناو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا، وازیش لە فێربوونی زانست مەهێنە لەبەر زوهد تیایداو حەزکردنت لە نەفامی.

- کوڕی خۆم لەبەر سێ شت فێری زانست مەبەو لەبەر سێ شتیش وازی لێمەهێنە، فیری مەبە بۆ ئەوەی دەمەقاڵێی پێبکەی یان شانازی پێوە بکەیت و یان خۆتی پێدەر بخەی و وازیشی لێ مەهێنە لێی لەبەر زوهدت بۆی یا شەرمکردنت لە خەڵکی یان ڕازی بوونت بەنەفامی.

- کوڕی شیرینم دەمەدەمێ لەگەڵ زانایاندا مەکە، چونکە لەسەریان قورسەو متمانەت لایان نامێنێت، دەمەدەمێش لەگەڵ نەزانانیشدا مەکە، چونکە کاری ناشیاو بەرامبەرت دەکەن و جوێنت پێدەدەن.

- کوڕەکەم ئارامگربە بەرامبەر ئەوانەی کە لەزانستدا لەسەر و خۆتەوەن وە ئەواناشی کە لەخوار خۆتەوەن، چونکە کەسێک دەگات بە ئاستی زانایان کە ئارامگربێت بەرامبەریان و هەمیشە لەگەڵیان بێ و بەنەرم و نیانی زانستەکەیان لێوەربگرێت.

- کوڕەکەم هەوڵی فێربوونی زانست مەدە لەسەر یەک، تا کار دەکەی بەوەی فێری بوویت.

- کوڕی خۆم هەوڵبدە بە منداڵی فێری زانست بە، چونکە فێربونی زانست بە گەورەیی قورسە.

- کوڕی خۆم با قسەت خۆش بێت و با ڕووت خۆش بێت، ئەوکاتە زۆر خۆشەویستر دەبیت لای خەڵکی لەو کەسەی کە دەبەخشێت.

- کوڕی خۆم چاکترین خواردن بخۆ و لەسەر خۆشترین جێگە بخەوە.

- کوڕی شیرینم ئەقڵی هیچ مرۆڤێک تەواو کامڵ نابێت تا دە شتی تێدا نەبێت :-

یەک: خۆ بەگەورە زانین لێی ئەمین بێت.

دوو: ئومێدی زیرەکی لێبکرێت.

سێ: لە دنیادا هەوڵی بژێوی بدات و ئەوەی زیاد بوو بیبەخشێت.

چوار: خۆ بەکەمزانینی لای خۆشەویستربێت لە ڕێز و گەورەیی.

پێنج: حەزی لە زەلیلی بێت زیاتر وەک لە عیزەت.

شەش: بەدرێژایی تەمەنی لە شارەزابوون لە ئاینی خودا بێزار نەبێت.

حەوت: لەلای خۆیەوە لە داواکردنی پێویستی بێزار نەبێت.

هەشت: چاکەی کەمی خەڵکی بەکەم بزانێت و چاکەی زۆری خۆشی بەکەم بزانێت.

نۆ: لە هەموویان گرنگترو گەورەتر ئەوەیە کە وابزانێت هەموو خەڵکی سەر زەوی لەو چاکترن و خۆشی لە هەموویان خراپترە.

دە: ئەگەر چاکەی لە کەسێک بینی پێی دڵخۆشبێ و ئاواتیبێ پێبگات، ئەگەر خراپەی لە کەسێکیش بینی بڵێ ئایا ئەم کارە خۆت و کەسوکارت سەرفراز و ڕزگار دەکات ، ئەمەش کاتێک دەبێت کە ئەقڵ تەواو کامڵ بوبێت.

- کوڕی شیرینم کاتێک سەفەر دەکەیت وورپابە لەسەر وڵاخەکەت خەوت لێنەکەوێت، چونکە زۆر خەوتن لەسەر وڵاخ دەبێتە هۆی بەربونەوە لەسەری، ئەگەر لە شوێنێک لاتدا لەوەڕی باش بوو لێی گەڕێ با تێر لەوەڕ بێت، وڵاخەکەت لەپێش خۆتدا تێر و پاراو بکە، ئەگەر سەفەرەکەت دور و درێژ بوو لە شەودا بکەوەرە ڕێ چونکە لە شەودا ڕێگە کورت دەبێتەوە، ئەگەر لەڕێگە لاتدا بۆ پشوو لە قەراخ ڕێگە لامەدە چونکە شوێنی مار و دڕندەیە، لەشوێنێکدا لابدە کە خۆشبێ و گڵەکەی نەرمبێ و لەوەڕی زۆر بێ.

کاتێ لەسواری وڵاخەکەت دەدەبەزی بۆ پشوودان پێش ئەوەی دابنیشی دوو رکاعەت نوێژ بکە و ئنجا بڵێ خودایە لە شوێنێکی پیرۆز دامبەزێنە، ئەگەر ویستت خۆت خاڵی بکەیتەوە لە دوری ڕێگە دابنیشە و خۆشت داپۆشە، کاتێکیش ئەو شوێنە جێدێڵی دوو رکاعەت نوێژ بکە و سەلام لەو خاکەو دەورووبەری ئەو شوێنەش بکە، چونکە هەموو خاک و زەوییەک فریشتەی هەیە.

کاتێک ویستت بەلای دەشتێک یان دۆڵێک یان چیایەکدا تێپەڕی زۆر یادی خودا بکە، چونکە دەشت و چیاکان هەندێکیان بانگی هەندێکیان دەکەن و دەڵێن ئایا ئەمرۆ کەسێک بەلاتاندا تێپەڕیوە یادی خودای کردبێ، ئەگەر توانیت نان نەخۆیت تا خێری لێدەکەیت بیکە.

هەرکاتێک لەسەفەردا بووی یادی خودا بکە، ئەگەر بەڕۆژوو بوویت تەسبیحات بکە، ئەگەر بە تەنیا بوویت نزا و دووعا بکە، نەکەی لەسەرەتای شەودا بکەویتەڕێ بۆ سەفەر هەوڵبدە لە ناوەڕاستی شەو و کۆتاییەکەیدا لە ڕێگە پشوو بدەی، نەکەی لەکاتی سەفەردا دەنگ بەرز بکەیتەوە مەگەر بۆ زیکر و یادی خودا، با لەسەفەردا شمشێر و کەوانەکەت پێ بێ و دەرمانیش لەگەڵ خۆت ببە بۆ ئەوەی هاوسەفەرە نەخۆشەکانت سوودی لێ ببینن، لەگەڵ هاوسەفەرەکانتدا لە هەمووشتێکدا لەگەڵیاندا کۆکبە کە لە خودات

نزیک بخاتەوە و لە تاوانت دوور بخاتەوە، ڕووخۆشبە لەگەڵیاندا ئەگەر شتێکیان پێویست بوو بەشیان بدە، کاتێک بانگیان کردی وەڵامیان بدەرەوە، کاتێک داوای یارماتیان لێکردی یارمەتیان بدە ، کاتێک داوای شایەتی هەقیان لێکردی شایەتیان بۆ بدە، بیروڕات لەگەڵیان ئاڵوگۆڕ بکە، ئەگەر بینیت ئەڕۆن تۆش لەگەڵیان بڕۆ یان ئەگەر ئیشێکیان ئەکرد یارمەتیان بدە، ئەگەر شتێکیان بەخشی تۆش لەگەڵیان ببەخشە، گوێ لە کەسانی لە خۆت گەورەتر بگرە، ئەگەر ڕێگەتان لێ تێکچوو بوەستن، ئەگەر دوودڵ بوون لە مەبەستی سەفەرەکەتان ڕاوێژ بکەن.

- کوڕی شیرینم یەکەم شت کە پێویستە لەسەرت ئاگات لێی بێت نەفستە، بەڕاستی هەموونەفسێک ئارەزووی هەیە، ئەگەر گوێت بە ئارەزووەکانت نەدا، ئەوا سنور دەبەزێنیت، بەڕاستی شەهوەت و ئارەزوو لە دڵدا شاراوەیە وەک شاراوەی ئاگر لە بەرددا، ئەگەر دابگیرسێت دەردەکەوێ و ئەگەر داشنەگیرسێت هەر شاراوەیە.

- کوڕی خۆم بەڕاستی چڵەپۆپە و لوتکەی گەورەیی و ڕێز لە دنیا و دواڕۆژدا ئەقڵی چاکە، کاتێک بەندە ئەقڵی جوان و چاک دەبێت هەموو ناتەواویەکانی بۆ ئەپۆشێ و یەکسانی بۆ بەرپا دەکات و پەروەردگاریشی لێ ڕازی دەبێت، مرۆڤ ئەوەندی لە ئەقڵ بەسە کە خەڵکی لە خراپەی بێوەی بن.

- کوڕەکەم ئەگەر لاڵێکی ژیربیت چاکترە لەوەی قسەکەرێکی نەزان بیت.

-کوڕی خۆم هەمووشتێک بەڵگەی هەیە بەڵگەی ڕێنیشاندەریش هەڵسوکەوتە بەڵگەی هەڵسوکەوتیش بێدەنگییە.

- کوڕەکەم ئەوەندە نەفامیت بەسە خەڵکی لەشتێک قەدەغە بکەی و خۆشت بیکەی.

- کوڕی شیرینم تکایە خۆت لەزۆر خۆری بپارێزە، چونکە زۆرخۆری نزیک لە نزیک دوور دەخاتەوە و دانایی ناهێڵێت.

- کوڕی خۆم خۆت لە تورەیی بپارێزە بەڕاستی توورەیی لەناوبەری دڵی مرۆڤی بەڕێزە.

- کوڕی خۆم خۆت کە تەمەڵی و بێزاری بپارێزە، چونکە ئەگەر تەمەڵ بیت هیچ مافێکت پێنادرێ، ئەگەر بێزاریش بیت لەسەر هەق ئارام ناگریت.

- کوڕی شیرینم خۆت لە خراپە بپارێزە ئەویش خۆی لێت بە دوور دەگرێت، چونکە خراپە بۆ خراپە دروستکراوە.

- کوڕی خۆم با تەنها پارێزگاران نانت بخۆن، لەکارەکانیشدا ڕاوێژ بە زانایان بکە.

- کوڕی خۆم من هەرگیز لەسەر بێدەنگی پەشیمان نەبووم، چونکە ئەگەر قسەکردن زیو بێت بێدەنگی زێڕە.

- کوڕی خۆم ئاگات لەدەریا بێت کاتێک زۆر دەبێت، ئاگاشت لە پاشا بێت کاتێک تورە دەبێت.

- کوڕی خۆم ڕێگری بکە لەوەی کە لەزارت دەردەچێ پێویستە لەسەرت قسەیەک بکەیت کە سودت پێبگەیەنێت.

- کورە ئازیزەکەم هەرکاتێک نوێژ هات لەبەر هیچ هۆیەک دوای مەخە، نوێژەکەت بکە و پشوویەک بدە، چونکە نوێژ قەرزە لەسەرت بە جەماعەت ئەنجامی بدە ئەگەرچی بەژێر ڕمیشەوە نوسابێت.

- کوڕی خۆم کاتێک داوای شایەتیت لێکرا شایەتی بدە، کاتێک داوای یارمەتیت لێکرا یارمەتی بدە، کاتێک ڕاوێژت پێکرا پەلەمەکە تا سەرنجامی کارەکە دەبینیت.

- کوڕی خۆم پیاو هەیە قسەیەک دەکات تا پێی دەگووترێت گێل، گێلیش نیە. پیاو هەیە بێدەنگیش دەبێت تا پێی دەوترێت ئارامگر، ئارامگریش نیە.

- کوڕی شیرینم کەسی نەفام مەکە بە نوێنەر ئەگەر کەسی زیرەکت دەست نەکەوت ئەوا خۆت ببە بە نوێنەری خۆت.

- کوڕی خۆم لەناو هاوەڵەکانتدا وا خۆت نیشانبدە کە پێویستت پێیان نیە.

- کوڕی خۆم کەسێک قسە بکات بۆ کەسێک کە گوێ لە قسەکانی نەگرێت وەک ئەوە وایە خواردن پێشکەش بەئەهلی گۆڕستان بکات.

- کوڕی خۆم کەسی شایستە لە فێربوونی زانست قەدەغە مەکە زیاتر گێل دەبێت.

- کوڕی خۆم خۆت لە خراپە بپارێزە وەک ئەو چۆن خۆی دەپارێزێت.

- کوڕی خۆم پێش ئەوەی نەخۆش بکەوی بچۆ بۆلای پزیشک، واتە فریای هاوەڵەکانت بکەوە پێش ئەوەی پێویستت پێیان بێت.

- کوڕی خۆشەویستم ئەگەر گومانت لە مردن هەیە مەخەوە تۆ هەروەک چۆن دەخەویت دەشمریت، ئەگەر گومانت لە زیندوو بوونەوەش هەیە لە خەو هەڵمەستە هەر وەک چۆن لە خەو هەڵدەستیت لەدوای مردنیش زیندوو ئەکرێیتەوە.

- کوڕی خۆم خۆت لە هاوسەری خراپ بپارێزە، چونکە پیرت دەکات پێش کاتی پیربوونت، خۆت لە ئافرەتانی خراپ بپارێزە چونکە ئەوان هەرگیز بۆ چاکە بانگت ناکەن.

- کوڕی خۆم بەڕاستی ئاڵتون بە ئاگر تاقیدەکرێتەوە، بەندەی چاکیش بە بەڵا و ناخۆشی تاقیدەکرێتەوە، خودای گەورە هەرکاتێک کۆمەڵێکی خۆش بوێ تاقیان دەکاتەوە، هەرکەس ڕازی بێت خوداش لێی ڕازی دەبێت، هەرکەسێکیش ڕازی نەبێت خوداش لێی ڕازی نابێت.

- کوڕی خۆم هەموو کوسێک سەگی خۆی هەیە تۆش مەبە بەسەگی هاوەڵەکانت.

- کوڕی خۆم ڕەوشتی ناشرین و زۆر داواکردنی شت لە خەڵکی نیشانەی نەفامییە.

- کوڕی خۆم هەرکەسێک نهێنی خۆی بشارێتەوە جڵەوی کارەکانی هەووی لەدەستی خۆیدایە.

- کوڕی شیرینم خۆت لە درۆ بپارێزە، چونکە بەڕاستی درۆ مرۆڤ وەک گۆشتی چۆلەکە حەزی لێدەکات و کەم کەس قێزەونە بەلایەوە.

- کوڕی خۆم زانست شتێکی باشە بەڵام لەگەڵ ئارام گرتندا چاکترە، بێدەنگیش چاکە بەڵام لەگەڵ دانایدا چاکترە.

- کوڕی شیرینم بەڕاستی زمان کەڵبەی جەستەیە ووریابە لەوەی کەشـتێک لە زمـانتەوە دەرنەچێـت و جەسـتەت لەنـاو ببـات ئـان پەروەردگارت تورە بکات.

- کوڕی خۆم ئەگەر مرۆڤی دانا هەرکاتێک پێت گەیشت و بەدار عەساکەی لێی دای چاکترە لە مرۆڤی نەفام ئەگەرچی پێشت گەیشت دڵخۆشت بکات.

- کوڕی خۆم ئەگەر مرۆڤی بە ئارام زیانیشت پێبگەیەنێت چاکترە لەوەی مرۆڤی گێل چەوتت بکات.

- کوڕی خۆم مرۆڤ سێ سێ یەکە، سێ یەکی بۆ خودایە، سێ یەکی بۆ خۆیەتی، سێ یەکی بۆ کرمە، ئەو سێ یەکەی کە بۆ خودایە ڕۆحەکەیەتی و ئەو سێ یەکەی بۆ خۆیەتی و کارو کردەوەکانیەتی و ئەو سێ یەکەی بۆ کرمە لاشەکەیەتی.

- کوڕی شیرینم بە خۆشەویستیت لە دۆستانی خودا لە خودا نزیک بەرەوە، بە ڕق بوونیشت لە گوناهباران لە خودا نزیک بەرەوە.

- کوڕی خۆم زۆر باسی خەڵکی مەکە و مافیشیان مەخۆ ستەمکار مەبەو خۆشت لە دوعای ستەملێکراو بپارێزە.

- کوڕی خۆم بەڕاستی دانای ئەوەیە هەشت شت بکەی:

یەک: دڵی مردوو زیندوو بکەیتەوە.

دوو: لەگەڵ هەژاردا دابنیشیت.

سێ: لەگەڵ پاشادا دانەنیشیت.

چوار: یارمەتی لێقەوماو بدەی.

پێنج: کۆیلە ئازاد بکەی.

شەش: دالدەی ڕێبوار بدەی.

حەوت: یارمەتی هەژار بدەی.

هەشت: ڕێز بۆ کەسی بەڕێز و گەورەیی بۆ کەسی گەورە زیاد بکەی.

که ئەوە چاکترە لە ماڵ و پاراستنە لە ترس و تێشووە لە شەڕدا و کەلوپەلی بازرگانیە لە کاتی شەڕکردندا و ئەوە تکا کارە لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی پێشهات ناخۆشیەکاندا و ڕێنیشاندەریشە کاتێک دەرون پڕ دەبێت لە دڵنیایی و باوەڕ و داپۆشەریشە بۆی لە کاتێکدا کە جل دایناپۆشێت.

- کوڕی شیرینم شەرم لە خودا بکە بەو ئەندازەیەی لێوەی نزیکی، لە خودا بترسە بەو ئەندازەیەی کە دەسەلاتی بەسەردا هەیە.

- کوڕی شیرینم خۆت لە زیادەڕەوی بپارێزە چونکە لێپرسینەوەی سبەینێت زۆر وردە.

- کەڕەکەم بـا خـودای گەورە لە شـوێنێک نەت بینێـت کە نەهـی لێکردووی کە لەوێ بیت، با لەشوێنێک بتبینێت کە فەرمانی پێکردوی لەوی بیت.

- کـوڕی خـۆم لە کـۆڕ و کۆبـونەوەدا لە شـوێنی بەرز دامەنیشـە، چونکە شوێنی نزم چاکترە لە شوێنی بەرز.

- کوڕی خۆم لەبەر خودا خەڵکت خۆشبوێ و هەر لەبەر خوداش ڕقت لەخەڵکی بێت، با گوناهباران چەورت نەکەن.

-کوڕی خۆم دنیا خێری تێدا نیە تەنها بۆ دوو جۆر کەس نەبێت، کەسـێک گوناهــ و تـاوانی هەیە و بەڵام ئێسـتا تەوبەی کـردووە و ئەیەوێـت بەکـاری چـاکە بیسـڕێتەوە بەڵکـو خـودای گەورە لە گوناهەکانی رابردوی خۆش بێت، کەسێکیش هەر کاری چاکە ئەنجام دەدات و داوای پلەی بەرزتر دەکات و کارە چاکەکانی لەخۆی بایی ناکەن ئەگەرچی زۆریش بن چونکە نازانێت کە خودای گەورە لێی وەرگرتوە یان نا.

- لوقمانی حەکیم لەسەرە مەرگدا ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد و دەیگووت: من زۆر ئامۆژگاریم کردووی بەڵام ئێستا ئامۆژگارییەکت دەکەم کە شەش خاڵە هەموو زانست لەمەدا کۆبۆتەوە:

یەکەم: خـــۆت ســـــەرقاڵ مەکە بەدنیـــاوە مەگەر بەقەدەر ئەو ئەندازەیەی کە تێیدا دەمێنیتەوە.

دووەم: پەروەردگـــارت بپەرســـتە بەو ئەنـــدازەیەی کە پێویســـتت پێیەتی.

سێیەم: هەوڵ بۆ دواڕۆژ بدە بەو ئەندازەیەی تێیدا دەمێنیتەوە.

چوارەم: با هەوڵدانت بۆ ئاگری دۆزەخ بەو ئەندازەیەی تێگەیشتنی خۆت بێت کە دڵنیای ڕزگار بونت نیە لێی.

پێنجەم: با جورئەت و بوێریت لەسەر تاوانکردن بە ئەندازەی ئارام گرتنت بێت لەسەر ئاگری دۆزەخ و سزای خودا.

شەشـــەم: کاتێـک ویســتت گوناهێـک بـکەی لە جێگەیەکـدا بـیکە کە خوداو فریشتەکانی نەتبینن.

- کــوڕی شــیرینم ئامۆژگاریــت دەکەم بە دوو شــت کە بەردەوام دەستیان پێوە بگری، پارە بۆبژێوی ژیانت، دینداری بۆ دواڕۆژت.

- کوڕی شیرینم لەسەر ئەژنۆ بڕۆ بۆلای زانایان، دەمەقاڵێیان لەگەڵ مەکە ڕقت لێ هەڵدەگرن.

- کـوڕەکەم بە ئەنـدازەی پێویسـتی خـۆت هەوڵ بـۆ دنیـا بـدە، زۆر هەوڵ بدە بۆ دواڕۆژت هەموو دنیا بە یەکجاری پشـت گوێ مەخە با هەژار نەبیت و ببیتە بار بەسەر خەڵکیەوە.

- کـوڕی خـۆم کاتێـک پێویسـتیت بە دەســەڵاتدار بـوو سـور مەبە لەسەری و داوا مەکە مەگەر لە کاتی خۆشی و دڵئارامیدا.

- کوڕی خۆم ڕۆژوویەک بگرە کە ئارەزوەکانت تێک بشکێنێت، ڕۆژوویەک مەگرە کە زیان بە نوێژەکانت بگەیەنێت، چونکە نوێژ چاکترە لە ڕۆژوو، وەک باوک وایە بۆ هەتیوو، وەک مێرد وایە بۆ بێوەژن، بە خزمەوە مەدە وەک مار، لەگەڵ نەفام دامەنیشە، هاوەڵێتی دوو ڕوو مەکە.

- کوڕی خۆم چاوەڕێی خۆشەویستی نەفام مەکە کە وا ببینێت تۆ لە کارەکانی ڕازیت، ئاگات لە توڕەیی و ژیری دانابێت.

- کوڕی خۆم چاوەڕێی سوپاسی خەڵکی مەکە با لۆمەت نەکەن وەک ئەو کەسە وابە کە بەردەوام هەوڵی خۆی دەدات و خەڵکیش بێوەین لێی.

- کوڕی خۆم بە دانایی لەگەڵ نەفامدا قسە مەکە بە درۆت دەخەنەوە، بە نەفامانەش قسە لەگەڵ داناکاندا مەکە ڕقت لێهەڵەگرن.

- کوڕی خۆم داوای یارمەتی لە کەسێک مەکە کە فێڵت لێدەکا، داوا لە چروکیش مەکە چونکە ئەگەر نەتداتێ گاڵتەت پێدەکات، ئەگەر بشتداتێ منەت دەکات بەسەرتدا.

- کوڕی خۆم داوای لێبووردن لەکەسێک مەکە کە حەز نەکات داوای لێبووردنی لێبکەی، داوای یارمەتیش لە کەسێک مەکە کە حەز ناکات پێویستیت بۆ جێبەجێ بکات.

- کوڕی خۆم کەسێک ئارامگر بێت لەسەر ناڕەحەتی خەڵکی ئەبێت بە گەورەیان.

- کوڕی خۆم پیاوترین و بەڕەوشترین کەس کەسێکە کاتێک پێوسیتی هەبێت دوور دەگرێت کاتێکیش داوای پێویستی لێبکرێت نزیک دەبێتەوە.

- کوڕی شیرینم هیچ دەوڵەمەندییەک وەک لەشساغی نیە، هیچ نیعمەتێکیش وەک بەختەوەری نیە.

- کوڕی خۆم بەڕاستی خەڵکی بەڵێنی زۆریان بینیوە و بەپەلەش دەڕۆن بەرەو دواڕۆژ، تۆش ماوەیەکە پشتت لە دنیا کردووە و ڕووت لە دواڕۆژ کردووە بەڕاستی ئەم خانو ماڵەی تۆ دەڕۆی بۆلای نزیکترە لێتەوە لەو خانوو ماڵەی لێی دەردەچیت.

- کوڕی خۆم من چەند ئامۆژگارییەکت دەکەم کە ئەگەر تۆ دەستیان پێوە بگریت هەمیشە گەورەو پێشەوا دەبیت، ئارامگربە بۆ نزیک و بۆ دوور، ڕوخسارت بگرەوە لە بەخشندە و چرووک، سەردانی خزمانت بکە، با هاوەڵەکانت ئەوانەبن کاتێک لێیان جیادەبیتەوە یان لێیان جیا دەبنەوە ڕەخنەت لێناگرن.

- کوڕی خۆم پێویستە کەسی ژیر لە چوار کاتدا خۆی بناسێت:

یەک: کاتێک کە موناجاتی پەروەردگاری تێدا دەکات.

دوو: کاتێک کە لێپرسینەوەی خۆی دەکات.

سێ: کاتێک کە بژێوی ژیانی تیا پەیدا دەکات.

چوار: کاتێک لەنێوان خۆی و خۆشیەکانی لە هەموو کاتەکانـدا داوای یارمەتی تیا بکات.

- کوڕی شیرینم کەسی حەسود سێ نیشانەی هەیە:

یەک: ئەگەر هاوەڵەکەی لەلای نەبێت غەیبەتی دەکات.

دوو: ئەگەر لەلای بێت ماستاوی بۆ دەکات.

سێ: لەکاتی ناخۆشیدا سەرەخۆشی لێدەکات.

- کوڕی خۆم کارێک کە نازانی کەی دێت خۆتی بۆ ئامادە بکە پێش ئەوەی پێت بگات.

- کوڕی خۆم ئەگەر بە منداڵی ڕەوشت فێربیت کە گەورە بوویت سودت پێدەگەیەنێت.

- کوڕە شیرینەکەم بەڕاستی دنیا کەمە و لەو کەمەشـدا تەمەنی تۆ کەمە.

- کوڕی خۆم کردەوە ناتوانرێت ئەنجام بدرێت مەگەر بەدڵنیاییەوە هەرکەسێک دڵنیایی لاوازبوو کردەوەشی کەم دەبێت.

- کوڕی خۆم ئەگەر لەبەرامبەر قسەکردندا شکستت هێنا لەبەرامبەر بێدەنگیدا شکست مەهێنە، سووربە لەسەر ئەوەی گوێ بگری نەوەک قسەبکەی.

- کوڕی خۆم خۆت لە پاڕانەوەی ستەملێکراو بپارێزە، چونکە نزیکترین شتە لەخواوە بۆ گیرابوون.

- کوڕی خۆشەویستم با گرنگیدانت بۆ شتێک بێت کە داوات لێکراوە، باگرنگیدانت بۆ شتێک نەبێت کە پێویستت نیە، جا کەوایە زۆر گرنگی بە دنیا مەدە چونکە لە دوارۆژ بێئاگات دەکات.

- کوڕی خۆم با خۆشوویستن و ڕق لێبوونت لەبەر خودا بێ و لەگەڵ خراپەکارانیشدا نەرم و نیان مەبە.

- کوڕی خۆم بسڵەمێرەوە لە یەک کەسیش مادام ئەو کەسە شایەنی لێسڵەمینەوە و حەزەر لێکردنە.

- کوڕی شیرینم ئەنجامدانی نوێژی فەرز چاکترە لە هەموو کارێک بەڕاستی نمونەی نوێژ و تەسبیحات وەک کەشتی وایە لەناو دەریادا، ئەگەر کەشتیەکە تیاچوو ئەوانەی ناویشی تیادەچن.

- کورم بەڕاستی کەسی ڕەوشت ناشرینی دەم شڕی بەدبەخت کاتێک کە قسە دەکات زمانی خۆی ڕسوای دەکات و ئەگەر بێدەنگیش بێت نەزانیەکەی ڕسوای دەکات، ئەگەر کارێک بکات خراپە دەکات ئەگەر کارێکیش نەکات تەمەنی بە فیڕۆ دەڕوات، ئەگەر دەوڵەمەند بێت یاخی دەبێت ئەگەر هەژاریش بێت نا ئومێد دەبێت، ئەگەر دڵخۆش بێت زیز دەکات ئەگەر خەمباریش بێت دەبێتە دیل، ئەگەر ڕێزی بگرێت یاخی دەبێت ئەگەر ڕێزی نەگرێت ڕەشبین دەبێت، ئەگەر داوا بکات سووورە لەسەری و ئەگەر داواشی لێبکرێت نابەخشێت، ئەگەر پێبکەنێت قاقا دەکات ئەگەر بشگری هاوار دەکات، ئەگەر تووڕەبێت زۆر توندە ئەگەر باسیشی بکرێت تووڕە دەبێت، ئەگەر ببەخشێت منەت دەکات ئەگەر پێی ببەخشرێت سپڵەیی دەکات.

ئەگەر نهێنی لا دانرا خیانەتی لێدەکات ئەگەر نهێنیشی لا دانایت بوختانت بۆ دەکات، ئەگەر لەخوار تۆوە بوو توانج لێدەدات ئەگەر لەسەرو تۆشەوە بێت تووڕە دەبێت، ئەگەر هاوەڵێتی بکەی ماندووت دەکات ئەگەر لێشی دوور بیت وازت لێناهێنێ، ئەگەر ڕێنمایی بکرێت ڕێنمای وەرناگرێت ئەگەر فەرمانی پێبکرێت گوێڕایەڵی ناکات، ئەوەی لەگەڵی دەژی بەختەوەر نیە ئەوەشی لێی دوورە لێی بێوەی نیە، کاتێک قسە دەکات نایپێکێت لەکاتی ناخۆشیدا ئارامگر نیە، لە بابەتێکدا ناوەستێت و کاری چاکە ئەنجام نادات، سوپاسی کەس ناکات و واز لەفێڵ کردن ناهێنێت.

لەکەسی سەرکەوتوو متمانە وەرناگرێت ئەگەرچی لەگەڵ دانایانیشدا ڕێک نەبێت بە زانستەکەی لەخۆی باییە، ئەگەر یەکێک لەگەڵ زانایاندا بێت وادەزانێت ئەو چاکەکارە ئەگەر خراپەکاریش بێت وادەزانێت بێدەسەلاتییەکەی زیرەکییە و خراپە و زیادەڕۆییەکەی وورەیە و نافامیەکەی ئارامگرییە، حەزی لەچی بێت وەری دەگرێت، ڕقی لە چیش بێت وازی لێدێنێت، ئەگەر هەق و ڕاستی لەگەڵ

ئارەزویدا بوو ستایشی دەکات خۆ ئەگەر پێچەوانەی ئارەزووی بوو بە درۆی دەخاتەوە و وازی لێدێنێت، کاتێک پێویستی و ئیشێکی بە هەق بوو پرسیاری دەکات کاتێک پرسیاریشی لێبکرێت وەڵام ناداتەوە، کاتێک ئەهلی هەق ئامادەبوون لەگەڵیانە کاتێکیش ئامادە نەبوون دەچێتە سەر ناهەق.

لەگەڵ زانایان دادەنیشێ و ملکەچیان نیە و گوێیان لێناگرێت کاتێک لەناو زانایانیشدا نەبێت فیز دەکات بەسەریاندا و پێیان پێدەکەنێ و هەق دەڵێ بەڵام بە کردەوە پێچەوانەیەتی، فەرمان بە چاکە دەکات و خراپە ئەنجام دەدات، فەرمان بە هەق دەکات لەسەر ناهەقیشە، هەمووجۆرە مامەڵەیەک لەگەڵ خەڵکیدا دەکات ئەگەر بۆخۆی بێت پێی خۆش نیە، چاکە پیشانی خەڵکی دەدات و خۆشی لێی دوورە ڕێگری لە خراپە دەکات و خۆشی ئەنجامی دەدات، فەرمان دەکات بە وورەبەرزی لە خۆیدا نیە و لەشەرع خۆی شارەزا دەکا و خۆی کاری پێناکات، بەکاری دوارۆژ شوێن دنیا دەکەوێ، ئەگەر بەهێزبێت توندە بەرامبەرت ئەگەر لاوازیش بێت لاوازترت دەکات ،ئەگەر دەوڵەماندبێت پێدەڵێت لە خۆ باییە ئەگەر هەژاریش بێت دەڵێت داماوە، ئەگەر سووربێت لەسەر چاکە پێت دەڵێت ڕۆچووە ئەگەر خاویش بیت دەڵێ زۆر لە خۆی دەکات، ئەگەر پێی ببەخشی پێتدەڵێ زیادەڕەوی دەکات ئەگەر نەشیدەیتێ ئەڵێ چروکە، ئەگەر نەرم بی لەگەڵی و لێی نزیکبیتەوە دەڵێ ماستاو چییە ئەگەر لێشی دوورە پەرێز بی دەڵێ فیز زلە.

- ئەی کوڕی شیرینم تووڕەییت بە ئارامگریت و سوکیت بە سەنگیت و ئارەزووت بە پارێزگاریت و گومانت بە دڵنیایت و ناهەقیت بە هەق و چروکیت بە بەخشندەیی تێک بشکێنە.

- کوڕی خۆم ئەگەر شەیتان لەڕێگەی گومان و دوودڵیەوە بۆت هات تۆ بە دڵنیایی و ئامۆژگاری بەسەریدا زاڵبە، ئەگەر لەڕێگەی تەمەڵی و بێزارییەوە بۆت هات بە باسی قەبر و قیامەت بەسەریدا زاڵبە، ئەگەر لەڕێگەی هاندان و ترساندنەوە هات بۆت هەواڵی ئەوەی بدەرێ کە دنیاش کۆتایی دێت.

- رۆژێک لوقمان بە کوڕەکەی گوت کە 3 ئامۆژگاری دەکات بۆ ئەوەی بە بەختەوەری بژیت.

یەکەم، هەوڵ بدە لە ژیانتدا باشترین خواردنی دنیا بخۆی

دووەم، لە نێو باشترین پێخەفی دنیادا بخەوە

سێیەم، لە نێو باشترین کۆشک و خانوودا بژی.

کوڕەکە لە وەڵامی باوکیدا گوتی، "باوکە ئێمە خێزانێکی هەژارین، چۆن دەتوانم ئەو هەموو شتەم هەبێت؟".

لوقمان لە وەڵامدا گوتی:

1. ئەگەر درەنگ و بە ڕێژەیەکی کەمتر نان بخۆی، هەرشتێک کە بیخۆی تام و چێژی باشترین خواردنی دنیای هەیە

2. ئەگەر زۆر کار بکەی و هەندێ درەنگ بخەوی، لە هەر شوێنێکدا بخەوی، وا هەست دەکەی باشترین پێخەفی دنیایە.

3. ئەگەر لەگەڵ خەڵکدا هاوڕێ بیت، لە نێو دڵی ئەواندای و بەو شێوەیە باشترین کۆشکی دنیا هی تۆیە.

- کوڕی خۆم خۆت لەخەڵک بە چاکتر مەزانە چونکە خۆ لەخەڵک بە چاکتر زانین، نزیک لە نزیک دوور دەخاتەوە و دانایش ناهێڵێت.

- لوقمــانی حەکــیم لەژێــر دارێــک دانیشــتووە، ڕێبوارێــک لێــی نزیکدەبێتەوە و لێی دەپرسێت:

بەچەند دەگەمە ئەو گوندە؟

لوقمان وەڵامی ناداتەوە.

پاشان جارێکی دیکە لێی دەپرسێتەوە، بەچەند دەگەمە ئەو گوندە؟

دیسان وەڵامی ناداتەوە.

بۆ جاری سێیەم دەپرسێت، بێزەحمەت بەچەند دەگەمە ئەو گوندە؟

دیسان وەڵامی ناداتەوە.

کابرای ڕێبوار تووڕە دەبێت و دەڵێت ئەمە شێتەو دەڕوات. چەند هەنگاوێک دوورناکەوێتەوە (لوقمانی حەکیم) هاوار دەکات. کاکی ڕێبوار بە نیوکاتژمێر دەگەیتە گوندەکە!

ڕێبوارەکە دەگەڕێتەوە و دەڵێت: سێ جار لێم پرسیت وەڵامت نەدامەوە، ئێستا بۆچی وا دەڵێیت؟

لوقمانی حەکیم دەڵێت: ئاخر ڕەوتی ڕۆیشتنتم نەدەزانی، بەس کاتێک بەڕێگادا ڕۆیشتی زانیم بەچەند دەگەیت بۆیە تا ڕەوتی ڕۆیشتنتم نەزانیبا پێویست نەبوو هیچ بڵێم!